حەمەی فەرەج هەڵەبجەیی

# لە شنروێوە بۆ ستۆکهۆڵم

## چەند لاپەڕەیەک لە بیرەوەرییەکانم
## لە شۆڕشی نوێدا
## بەرگی دووەم

2004

حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
زنجیرە (٢٦٧)

حەمەی فەرەج هەڵەبجەیی

## چەند لاپەڕەیەکی یادگارەکانم

# لەشنرویەوە بۆ ستۆکهۆلم

بەرگی دووەم
لەشۆڕشی نوێدا

سلێمانی ٢٠٠٤

# لەشنرویَوە بۆ ستۆکهۆڵم

* بابەت: بیرەوەری
* حەمەی فەرەجی هەڵەبجەیی
* پێداچوونەوەو بەرگ و مۆنتاژ: فوئاد عەبدولڕەحمان
* سەرپەرشتیاری چاپ: سەلام فاتح
* چاپ: چاپخانەی راز
* تیراژ: ١٠٠٠ دانە
* ژمارەی سپاردن (٦٢٩)ی ساڵی ٢٠٠٤ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە
* سایتی وەزارەتی رۆشنبیری: www. roshnbiri. org

# له شنروێوه بۆ ستۆکهۆڵم

حەمەی فەرەج

# ناوەرۆکی بەرگی دووەم

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|

## بەشی دووەم

## بەشی سێیەم



## بەشی چوارەم



## بەشی پێنجەم

# سەرەتایەك

حەمەی فەرەج هەڵەبجەیی

هاوكاتی یادی دامەزراندنی (ی.ن.ك)

سلێمانی/ ١ ی حوزەیرانی ساڵی ٢٠٠٢

بۆچی مرۆڤ شۆڕش دەكا؟ بۆچی ئەم هەڵوێستە وەردەگرێ؟ بۆچی دژ بەو داكەوتەی تێیدایە بەرەنگار دەبێتەوەو داكۆكی دەكاو ڕێگای قورسو پڕ مەینەتو ناڕەحەتیی خەبات هەڵدەبژێرێ؟ خەباتێ، كە ڕەنگە قوربانییەكی هەرە گەورەو سەرمایەیەكی یەكجار مەزنی دەروونیو گیانیو مرۆیی بوێت، جگە لەمەش، ڕەنگە خاكو وڵاتو نیشتمانێ بكاتە وێرانەو سوتماك.

دیارە پاساوی داكەوتانە بۆ بەرپاكردنی خەباتو بەرخۆدانێكی لەم شێوەیە پەیوەستە بەڕادەی نەگریسیو خوێنمژیو پلانگێڕیی ئەو دوژمنە داگیركەرە سەرسەختە، كە چارەنووسی گەلێ بەو ئاقارەدا دەباو سەرەنجامیش لەگەڵیدا دەكەوێتە شەڕو ململانێیەكی دوورخایەنو پڕهەڵدێرەوە.

ئێمەیش وەكو گەلی كورد، لە خاكو نیشتمانی خۆماندا بەشی گەورەو پڕ مەرگەساتیمان لەم داكەوتە بەركەوت. ئێمەی كورد نەك تەنها

دوژمنیّ، بەڵكو زیاد له دوژمنێك‌و بگره له پشتی دوژمنەكانیشمانەوه دوژمنانی تریش بوون لەپێناو بەرژەوەندییه تایبەتیەكانی خۆیان زۆر جار ئێمەی میللەتی بەشخوراوو بێ پشت‌و پەنایان رووبەڕووی چارەنووسێكی زۆرترسناك‌و مرۆڤ كوژران كردۆتەوه.

كورد له داكەوتی خەباتی رزگاریخوازییدا زۆر لەمێژه رووبەڕووی مەحاڵ بۆتەوه؛ مەحاڵێ، كه هەمیشه ویستی ئەو داگیركەرانه بووه. له ماوەی سەد ساڵی رابردوودا كوردستانی ئێمەیان كرده گۆڕەپانی شەڕو رووبەڕوبوونەوەی خوێناویی بەردەوام.

من وەكو رۆڵەیەكی ئەم گەله، هەر له سەرەتای شۆڕشی ئەیلولی ١٩٦١ەوه، بووم به پێشمەرگه تا هەرەسی ئەو شۆڕشه له ساڵی ١٩٧٥، پاشانیش له شۆڕشی نوێی گەلەكەماندا، هەر پاش ئەوەی له ساڵی ١٩٨٢ له زیندان ئازاد كرام، پەیوەندیم به شۆڕشی چەكدارییەوه كردەوه له شاخ. هەڵبەت، ئەو ماوانەی لەنێو شاریشدا بووم، بەردەوام به نهێنی كاری خەباتم كردووه.

یەكەم خانوو، كه له هەڵەبجەدا لەلایەن رژێمی بەعسی كۆنەوه سووتێنرا، له ساڵی (١٩٦٣) بوو، له گەڕەكی پیر محمد، خانووی ئێمه بوو. دوای ئەوەی كه تالانیانكرد سووتانیان. هەروەها هەرچی دوكان‌و ماڵ‌و ئۆتۆمبیل‌و گەراج‌و سەروەت‌و سامانمان هەبوو هی خۆم‌و برام‌و خزمەكانیشم بەهۆی ئەوەوه، كه من پێشمەرگه بووم هەموویان لێ

داگیرکردین‌و بەتاڵان بردیان. ماڵ‌و مناڵم هەموویان بێبەری کران لە خوێندن‌و خۆشگوزەرانی‌و لە زێدی خۆمان دەربەدەرکراین. ئەگەر بە سەردانیش بهاتینایەتەوە بۆ لای کەس‌وکارمان، دەبوایە بە شێوەیەکی نهێنی بوایە. هەر ساڵەو بە کولەمەرگی لە شوێنێ ژیاوین. ئەو ماوەیە، کە لە (تەوێڵە) بووین، ساڵی ١٩٦٣ رۆژانە ماڵ‌و منداڵمان دەچووە نێو ئەشکەوتەکانی تەوێڵە لە ترسی بۆردومانی فڕۆکەو تۆپ. هەروەها لە شوێنەکانی‌تریش هەروا ژیانمان دەبردەسەر.

بە راستی شاهیدی ئەوە دەبم، ئەو دلێرییەی لە پێشمەرگەی کورد دیومەو ئەوەی لە تواناى پێشمەرگەو کادیرەکانیدا بووە، ئەو خەباتەی ئەوان کردوویانە، بە هیچ لەشکرێکی دنیا نەکراوە؛ پێشمەرگەیەکی بێ پشت‌و پەناو بێ ئەوەی دەوڵەتێ پشتگیریمان بکا، بێ ئەوەی لە هیچ لایەکەوە یارمەتی بدرێین، سەرەڕای ئەوەش حکومەتە بیرتەسکەکانی تورکیاو سوریا هەردەم دوژمنایەتییان کردووین، جگە لە هێزە شۆڤێنی‌و زەبەلاح‌و عەسکەرتارەکەی عیراقیش، ئێمەی پێشمەرگەی کورد لە کوردستاندا کۆڵی خەباتمان نەداوەو سڵمان لە ئاگرو بارووت‌و فسفۆرو چەکی ناپاڵم‌و کیمیاوی‌و کۆمەڵکوژی نەکردۆتەوە تا بەم ئازادییە گەیشتین.

ئەو دوژمنانەمان، هەرچەند بەردەوام لەنێو خۆیاندا لەسەر لەنێوبردن‌و سڕینەوەی مۆرك‌و شوناس‌و مێژووی نەتەوەییمان کۆك‌و

تەبابوون، بەلاّم بە ناچاری، بۆ سوودو بەرژەوەندیی تاکانەی خۆیانیش جاربەجار یارمەتییەکیان پێشکەش کردووین، ئێمەش قەبولمان بووە، چونکە باری جوگرافیی ولاّتەکەی ئێمە واکەوتووە، ئەوانەی دراوسێمانن هاو بەرژەوەندییمان نین، ئەوان بەشێ، یان پارچەیەك لە جەستەی کوردیان تێدایەو نایانەوێ کورد بە هیچ ببین، نایانەوێ کورد دەسەلاّتو قەوالّەی خۆی هەبێ. ئەگەر ناکۆکییەکی ناوخۆیشیان هەبووبێ، ئەوا بە ئێمە چارەسەریان کردووە .

لە ماوەی ئەو چەندساڵەی رابردوودا، ئێمە توانیومانە لەگەڵ حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانو لە نێوەندی هاوکێشەو سیاسەتی رەگەزپەرستانەو شۆڤێنیانەی ئەم حکومەتانەدا بژینو بەرگریی قارەمانانە لە بوونو کەرامەتو نامووسو موقەدەساتمان بکەین. لەگەڵ ئەو هەموو سەختیو تاڵییەدا، زۆربەی زۆری دێهاتەکانی کوردستانمان بەدەستەوە بووەو ئەنجومەنو دادگاو ئیدارەمان تێدا داناونو زۆربەی شەوەکانیش شارە گەورەکانیشمان بەدەستەوەبووەو چیمان ویستبێ بەرامبەر پیاوخراپان لە شارە گەورەکاندا کردوومانە.

هەلّبەت بۆ جیهانمان سەلماند، کە ئێمە میللەتێکین داوای ئازادیو رزگاری دەکەینو دژی شەڕو کوشتنو داگیرکردنو تیرۆرین، دژی هەموو ستەمو نەریتێکی شەڕانگێزیو ئاژاوەیەکین، هەمووکاتیش لەگەڵ ئاشتی داینو خوازیاری سیستمی فیدراڵیو کۆمەڵی مەدەنیو

دیموکراسیو بەدیهێنانی مافە سروشتیو شەرعیەکانی گەلەکەمانین، هەروەك خوازیارین، هەر کەسێ پارێزراوبێو میللەتەکەشمان خۆشگوزەرانو سەربەرز بژیو دوربێ لە کوشتنو گرتنو هەر ستەمێکی سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئەخلاقی، ئەمەیش لە چوارچێوەی عیراقێکی دیموکراتو فیدراڵدا.

ئێمەی گەلی کورد میللەتێکی شارستانینو حەزمان لە شارستانیەتو لە پێشکەوتن کردووەو دژ بە هەموو زوڵمو ستەمو نادادپەروەرییەك وەستاوینەتەوە. ئێمە ١١ ساڵ پترە حکومڕانیی کوردستان دەکەین، دەمانەوێ لەم نیشتمانەدا بە ئاسودەیی بژین. هەرچیەکیشمان لەگەڵ بەرامبەرەکانماندا کردبێ، بۆ بەرگریکردن بووە لە خۆمانو لە خاکی پیرۆزی کوردستان. ئێمە وەکو گەلێکی بەشخوراو دەمانەوێ مافەکانمان لە چوارچێوەی عیراقێکی دیموکراتیو فیدراڵدا فەراهەم بێو حوکمی وڵاتەکەی خۆمان بکەین. ئێمە داوای وڵاتێکی دیموکراتی دەکەین، باوەڕمان بە دیموکراتیەت هەیە، چونکە ئەگەر دیموکراتیەت هەبوو، مافی هەمووولایەك پارێزراوە. ئەگەر دیموکراتیەت هەبوو، کەس زوڵم لە کەس ناکا.

جا لەبەر ئەوە، ئێمە باوەڕمان بەم ڕێبازە هەیەو شۆڕشمان بۆ ئەوە کردووە، کە دیموکراسی وەك ڕێبازو سیستمی سەردەم بێتە کایەوەو

ئێمەی کوردیش له چەسپاندنی دیموکراتیدا مافه نەتەوایەتیەکانمان پارێزراوبێ.

پێویسته هەموومان ڕۆژه ڕەشەکان بهێنینەوه بەرچاوی خۆمان، که ئێمه چۆن ئەو شۆڕشەمان کردوەو چۆن دروستبووو چەندیش کەوتووه لەسەرمان؟ لەم پێناوەدا به هەزاران گوندو شارو شارۆچکه وێران بوون، بێجگه لەوەی، که زیاتر له یەك ملیۆن مرۆڤی کورد بوونه قوربانیو سووتەمەنیی شۆڕش.

ئێمه که دەستمان به کاری سیاسیو پێشمەرگایەتی کرد، بۆ ئەوه بوو بتوانین خزمەتی میللەتەکەمان بکەین، هەروەها بۆ ئەوەی له ڕووی ئابووریو کۆمەلایەتیو سیاسییەوه چارەسەری کێشەو گرفتەکانی میللەتەکەمان بکەین. هەرچەنده پاش خەباتێکی دوورو درێژو هەزاران شەهید، ئەمڕۆ میللەتی کوردو خەباتی بزافی ڕزگاریخوازیو دۆزه ڕەواکەی پێی ناوەته قۆناغێکی نوێوەو به جیهاندا ناسراوه، کەوا میللەتێکی زوڵملێکراوو بەش خوراوەو هەموو مافه نەتەوەییو کلتوریو زمانیو مێژووییەکانی لێ زەوتکراوه.

ئێمه توانیومانه بەو بڕه توانا کەمەی هەمان بووه، له ماوەی ٤٠ ساڵدا بەربەرەکانێی هەموولایەك بکەینو ناوچەکانیشمان تا ڕادەیەك بپارێزین. بەلام له ساڵی ١٩٨٨ەوه، که سەددام بوو به سەرۆکی عیراق کار گەیشته ئەوەی حکومەتی بەعس به چەکی کیمیاویی له زۆربەی

زۆری شوێنەکانی کوردستان بدا، بەتایبەتی شاری هەڵەبجەی، کە گەورەترین شارۆچکەی عیراق بووە لە رووی جوگرافیو ژمارەی دانیشتوانەوە. ئەم خەڵکە بێ تاوانە لە پرۆسەیەکی جینۆسایددا بە سەروماڵەوە تیاچوونو زیاتر لە (٥) هەزار کەسیان لێ شەهید بوو. هەروەها (١٠) هەزاریش شەلو کوێرو کەم ئەندامو ئەوانی تریش دەربەدەر بوون، بێ ئەوەی بتوانن هیچ سوود لە سەروەتو سامانیان ببینن، هەموویان بەجێهێشت. تاکو ئێستاش ئەوانەی گەڕاونەتەوە، هەریەکەیان ئەوەتان لە ژورێکی گڵدا ژیان بەسەر دەبەن.

هەڵەبجە، کە لە ساڵی ١٨٨٩وە بووە بە قەزاو لە کۆندا مەیدانو کەلارو دەربەندیخانو پێنجوێن ناحیە بوونو سەر بە قەزای هەڵەبجە بوون. بەڵام ئەم شارە، کە لە دوای کیمیابارانکردنی ناوی بوو بە هەڵەبجەی شەهید، رۆژ بەرۆژ بەرەو بچووکبوونەوە چووە، جگە لە چەند خانوویەکی کەم نەبێ، کە لە (کانی ئاشقان) دروستکراونەتەوە لەگەڵ نەخۆشخانەو چەند قوتابخانەیەكو دروستکردنی چەند پرۆژەیەکی ئاوو ئاوەڕۆ، دەستی ئاوەدانیی وەکو پێویست پێنەگەیشتووە.

# پاش هەرەس

لە پاش هەرەسی شۆڕشی ئەیلوول لە ساڵی ١٩٧٥، لەگەڵ شەهیدی نەمر کاك علی عسكریو كاك كمال محی‌الدینو هەندێ لە برادەرانی دیکە لە ئێران چەند دانیشتنێکمان کرد. بیرمان لەوە دەکردەوە شۆڕشێکی نوێ لەپاش ئەو هەرەسە بۆ گەلەکەمان بهێنینە کایەوە، بەڵام کارێکی ئاسان نەبوو. لەبەر زۆر هۆ نەمانتوانی هەتا سەر لەنێو ئێراندا بمێنینەوە.

من خۆمو عبدالرحمانی کوڕم لە ڕێی تەوێڵەوە بۆ ژیان چووینەوە بۆ هەڵەبجە. نزیکەی سێ مانگ لەوێ بووم، هەر ڕۆژێ بەرپرسی ئاسایش دەیناردە شوێنم، پرسیارەکانی ئەوە بوون، کە خەڵکێکی زۆر هاتووچۆم دەکەنو ناوی ئەو خەڵکانەیان لێم دەویست، وەڵامی من ئەوە بوو دەمگوت: "من خەڵکی شارەکەمو خەڵکێکی زۆر دەمناسنو هاتنیان بۆ لام تەنها بۆ دیدەنییە." بەڵام دەزگای ئاسایش بڕوای بە من نەدەکردوو بەردەوام چاودێریان دەکردم. لە ئەنجامدا ڕۆژێ داوایان لێکردم دەبێ بچمە (مەڵبەندی ناوەندی دەزگای ئاسایشی ناوچەی باکوور لە کەرکوك). منیش بە قسەم کردنو بۆ ڕۆژی دوایی چووم. لەوێ لە ژوورێ دایاننامو پاش نیوکاتژمێر بانگیان کردم بۆ لای بەرپرسەکەیان. ئەویش لە پرسیارو وتووێژەکاندا داوای لێکردم کاری سیخوڕییان لەگەڵدا بکەم. پێم گوتن: "من ساڵانێکی زۆر پێشمەرگە

بووم، ئێستە چۆن بڕوا بە من دەکەن زانیاریی خۆیان بە من بدەن. من تەنها بیر لە کاسبی کردن‌و ژیاندنی خێزانەکەم دەکەمەوە."

ئەوان دیاربوو لە هەڵەبجەوە راپۆرتێکیان بۆ چووبوو، کە خەڵکێکی زۆر هاتوچۆم دەکەن، پێم گوتن: "من لە هەر جێگەیەکدا بم خەڵك هاتوچۆم دەکەن‌و جارێکی دی من بیرم لەوە نەکردۆتەوە بچمەوە شاخ، دەمەوێ ئێوە بە قسەی خەڵکی نەکەن، من ناحەزم زۆرەو دەیانەوێ کێشەو گیرو گرفتم بۆ دروست بکەن. من، کە گەڕاومەتەوە بۆ کوردستانی عیراق تەنها لەبەر ئەوەیە، کە خۆم‌و خێزانەکەم بە ئارامی بژین، ئەگینا دەمتوانی لە ئێراندا بمێنمەوەو لەوێ ژیانێکی زۆر باش بژیم." داوام لێکردن رێگەم بدەن خۆم‌و منداڵەکانم بچینە سلێمانی‌و لەوێ ناسیاوم هەن، کە دەتوانن یارمەتیم بدەن بۆ دۆزینەوەی ئیش‌و کار. بەڵام ئەوان پێیان گوتم بە مەرجێ دەتوانم بچم بۆ سلێمانی، کە هیچ کارێکی (خراپ)م لێ روو نەدا. گفتی ئەوەم پێدان‌و ئەوانیش ئاگاداری دەزگای ئاسایشی هەڵەبجەیان کرد، کە رێگەی دەرچوونم بدەن. بەر لە دەرچوونم لە هەڵەبجە ناونیشانی سلێمانی م لە سەر داوای ئاسایش لا جێ هێشتن.

لە سلێمانی لە گەڕەکی ئەسحابە سپی لە ماڵی (نوری مەلا حەکیم) نیشتەجێ بووین، لەوێ ماوەی دوو تا سێ مانگ بێ کارو کاسبی مامەوە. دوای ئەوە لە رێی دۆستێکمەوە لە شارەوانی‌ی (دوکان) ئیشێکم

دەست کەوت. ئۆتۆمبیلێکی (متسیوبۆشی)م هەبوو، بەیانیان پێی دەچووم‌و ئێواران دەگەڕامەوە. دوای ئەوە کارێکی دیکەم لە سەرچنار چنگ کەوت، کە بریتی بوو لە دروستکردنی (تەلبەند)ێ بە چواردەوری ئاوەگەی سەرچناردا، لەوێ من‌و عبدولڕحمانی کوڕم ئیشمان تێدا کردو سوودێکی باشمان لێ دەستکەوت.

پاش ماوەیەك لەگەڵ (شێخ عەبدول‌و حاجی ئەحمەدی گەلاڵی‌و حەمەئەمین رەسوڵ)دا کۆنتراکتی دروستکردنی پردمان لە دەزگای رێگاوبان‌و وەرگرت لە عەربەتەوە بۆ چوارتا. لە (ئەوقاف)یش مزگەوتێکمان گرت. جگەوە لە دروستکردنی خانووی کارگەی فەرشی ئۆردوگای کەناروێمان گرت. عەبدولڕەحمانی کوڕم سێ خانووی کەناروێی بۆ دروستکردن وەرگرت لەگەڵ دروستکردنی مزگەوتێ لە (باوەنوور). جگە لەوە ژمارەیەك پرد هەر لە (کانی پانکە)وە تا (سەراوی سبحان ئاغا) بۆ دێی (قوماش‌و موانەکان)، هەروەها کۆمەڵێ کاری دیکەم لەم لاو لەولا پەیدا کردو رۆژانە ژیانمان بەرەو باشتر دەرۆیشت، خانویەکیشمان بۆ خۆمان دروستکردو چارەسەری هەموو پێداویستیەکانی ژیانمان کرد.

# بەشداریکردنم لە شۆڕشی نوێدا

لە ساڵی ١٩٧٦ هەواڵم زانی، کە برای قارەمانو تێکۆشەر کاك (عومەر دەبابە) بووە بە یاریدەدەری بەڕێوەبەی گشتیی دارستان لە شاری (رومادی). لە مانگی ٧ی ١٩٧٦ لەگەڵ برای بەڕێز کاك (عوسمان بەکری بەقاڵ)، کە یەکێ بوو لە تێکۆشەرانی بزوتنەوەی کوردایەتی، چووین بۆ شاری (رومادی). ئەو کاتە برای بەڕێزو خۆشەویستمان کاك (فەوزی رشید نامیق)یش بە وەزیفە چوو بۆ (رومادی). ئەویش یەکێ بوو لە تێکۆشەرانی ڕێبازی کوردایەتی. لە ڕێگەی ئەوەوە هەوڵماندا پەیوەندی بە کاك (عومەر دەبابە)وە بکەین.

لە (رومادی) چووینە ماڵی کاك (عومەر دەبابە)و چاومان پێ کەوتو بە دوورو درێژی لەسەر بارودۆخی کوردستانو عیراق قسەمان کرد. کاك (عومەر) پێی گوتین: "من حکومەتی عیراقی تکلیفی لێکردووم بچم چاووم بە (مام جلال)و مامۆستا (ئیبراهیم ئەحمەد) بکەوێ لە دەرەوەی عیراق. منیش پێم گوتوون من چیم پێ دەکرێ؟ ئەوان چۆن بە گوێی من دەکەن؟ ناچاریان کردووم، کە هەر دەبێ بڕۆمو بیانبینم لە هەر کوێ بێو پێیان بڵێ بە ناوی (سەرۆك وولاتەوە)، تەنانەت بە جێگری سەرەك کۆماریش دایان دەنێنین ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ عیراقو [illegible]یشیان بۆ دادەنێنین. با بە هەموو لایەکمان خزمەتی گەلی

عیراق بکەین. منیش پێم گوتوون ئەی ئەگەر بە گوێیان نەکردم؟ گوتیان تۆ برۆ هەوڵ بدە بیان بینە بزانە چی دەڵێن؟"

کاك (عومەر)یش بۆ ئێمەی باس کرد. گوتی: "منیش پێم خۆشە برۆم بۆ ئەوی بزانم دەنگ‌و باسیان چییە."

ئێمەش پێمان گوت: "زۆر پێمان خۆشە برۆیت بە مەرجێ لای حکومەتەوە تووشی موسیبەت نەبی‌و بە ناوی هەموومانەوە قسەیان لەگەل بکە بۆ ئەوەی ئێمە بزانین بەتەمای چین ئەوان؟"

دوای ماوەیەك کاك عومەر گەڕایەوە. جارێکی دیکەش ئێمە بە نهێنی سەردانی کاك عومەرمان کرد بۆ رومادی. شەو لە ماڵی ئەواندا ماینەوە، بە درێژی باسی سەفەرەکەی کرد، کە مام جلال‌و مامۆستا ئیبراهیم [illegible] دیوەو قسەکانی هەموو بۆ باس کردوون‌و وەزعی کوردستانیش. مام جلالیش باسی وەزعی دوەلیی بەدرێژی بۆ کردووە، کە تا ئێستا ئێمە وەکو کورد وەزعمان باشەو زۆر لایەنیش بەڵێنیان پێداوین، کە ئەگەر شۆڕش هەلگیرسێتەوە، ئەوا پشتگیریمان بە هەموو شێوەیەك بکەن، بەتایبەتی حزبی شیوعی، کە زۆر لە لێپرسراوەکانیانی دیبوو، بەڵنیاندابوو، ئەگەر ئەمجارە شۆڕش دەست پێبکەینەوە، ئەوا بە هەموو جۆرێ پشتگیریمان دەکەن. هەروەها داوای لە برای نەمر کاك عومەر دبابە کردبوو، کە هەوڵ بدەن ریزەکانی

خۆیان رێك بخەنەوەو بێنە دەرەوە بۆ کوردستان، چونکە لە ماوەیەکی کەمدا خۆی دەگەڕێتەوە بۆ کوردستان.

کاك عومەر بە درێژیی ئەم قسانەی بۆ گێڕاینەوە، کە ئێمە ناژین لەم وولاتەدا لەژێر دەستی بەعس. هەروەها بۆی باسکردین، کە چاویشی بە برا قارەمانو نەمرەکان کاك دکتۆر خالیدو کاك عەلی عەسکەریو تاهیری عەلی والی بەگ کەوتووەو بۆ ئەوانیشی باسکردووە، کە هەوڵ بدەن کاروباری خۆیان لابەلا بکەنو بچنە دەرەوە. هەندێ کادری دڵسۆزی تریشمان هەبوو بە نهێنی ئاگاداریان بکەن تا رووبکەنە شاخە سەربەرزەکانی کوردستان بۆ ئەوەی بتوانین هێزێکی رێكوپێكو رێکخراو بۆ پاراستنی کوردستان، لەسەر شێوەیەکی تازەو گونجاو دروست بکەین. هەروەها بە منیشی گوت: "بەڵکو هەوڵ بدەی ئیشو کارەکانی خۆت لابەلا بکەیت، چونکە مام جلال بەدەمی پێی گوتووم، کە پێت بڵێم."

ئەوە بوو، کاك عومەر چووە دەرەوە. کاك دکتۆر خالیدو کاك عەلی عەسکەری بە نهێنی هەواڵیان بۆ ناردم، کە چاوم پێیان بکەوێ.

من لە ماڵی نوری ملا حەکیم دا لە سابونکەران چاوم پێیان کەوتو پێیان گوتم: "تۆش بەڵکو ئیشو کارەکان لابەلا بکەیت، وا ئێمە دەڕۆین.

سێ قۆڵی لەگەڵ شەهیدانی نەمر کاك عەلی عەسکەری‌و کاك دکتۆر خالیددا وارێککەوتین، کە من تاکو ماوەیەك لێرەدا بمێنمەوە. هەروەها دوای ئەوانیش شەهیدانی نەمر کاك تاهیری عەلی والی بەگ‌و کاك ستاری سعید خلف لە سلێمانی، پێش ئەوەی بڕۆنە دەرەوە، داوایان لێ کردم کە بچینە دەرەوەو هەوڵ بدەین بۆ کۆکردنەوەی پێشمەرگە.

لە قسەکانی ئەواندا دیار بوو، کە دەیانویست هەریەکێ بۆ خۆی حزبێ دروست بکا. منیش ئەوەم بە باش نەدەزانی‌و بەرژەوەندیی خەڵکی کوردستانی تێدا نەبوو. چونکە بەرژەوەندیی خەڵکی کوردستان لە تەبایی‌و برایەتیدا دەبینیەوە. ئەوەشم پێ گوتن: "ئێوەش هەوڵ بدەن تووشی ناکۆکی‌و بەربەرەکانی نەبن لەناو خۆتاندا، چونکە دوژمنەکان هەردەم لە ناکۆکیەکانی ئێمە سوودیان وەرگرتووە. من وەکو برایەکی ئێوە داواتان لێدەکەم بواری ناکۆکی‌و ئاژاوە مەدەن، چونکە خەڵکێکی هەلپەرست هەیە ئیستفادە لەو بۆشاییە دەکا. من پێم باشە ئەم شتانە لەگەڵ بەرێزتانا باس بکەم وەکو کوردێ، بەڵام چیشم پێ بکرێ بۆ بەرژەوەندیی خەڵکی کوردستان، درێخی ناکەم. تکام وایە ئەم قسانە هەر بۆ خۆتان بێ."

دوای ئەوە یەکترمان ماچ کردو خوا حافیزیمان لە یەکتر کردو هەر ئەو شەوە سلێمانی‌یان بەجێ هێشت.

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، لە ماوەیەکی کەمی دوای هەرەسدا، سەرلەنوێ مەفرەزەی سەرەتایی‌ی لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستاندا دروستکردەوەو بانگەوازی شۆڕشی نوێی راگەیاند.

من لەو کاتەوە کەوتمە چالاکی‌و چەند جارێ پارەی چاکم بە ناوی یارمەتییەوە بۆ شۆڕش کۆکردەوەو بە ئاگاداریی کاك عومەر فەتاح‌و دوکتۆر خەسرەوو کاك مەحمودی مەلا عیزەت ناردم بۆ نێو شۆڕش.

ماڵەکەشمان بەردەوام خەڵکێکی زۆر خۆی تیادا حەشار دەدا. کۆمەڵەی رەنجدەران یش پەیوەندییان بە عەبدولڕەحمان کوڕم دوە کردبوو، کاری بەر پرسیارێتییان لە نێو شاری سلێمانی‌دا پێ سپاردبوو. ئاگام لێبوو ئەویش شەوو رۆژی کردبوو بە یەك‌و هەموو کاتەکانی بەکاری رێکخستن‌و کوردایەتییەوە خەرج دەدا. من تەنها خەمی خۆم نەبوو، بەڵکو مەترسیی گەورەم لە (عەبدولڕەحمان) بوو، کە بگیرێ یاخود خراپەکارییەکی بێتە رێ.

لەو ماوەیەشدا چەند جارێ لایەن (مام جەلال)ە نامەم بۆ دەهات، کە بچمە دەرەوە. جارێکیان (مام جەلال) راسپاردەیەکی هەبوو بۆ (ئیمام خومەینی).[1] نامەیەکی نارد تا من لەرێی خۆمەوە بیگەیەنمە دەستی

[1] ئەو سەردەمە (ئیمام خومەینی) لە شاری نەجەف بوو لە عیراق.

(ئیمام خومەینی). ئیتر دیار بوو میری گومانیان لە جموجوڵەکانم کردبوو. دوارو دوور چاودێرییان دەکردم.

لە ساڵی ١٩٨٠دا بە ناوی چارەسەری نەخۆشییەوە چوومە وڵاتی (بولگاریا)و لەوێ دوو مانگێ مامەوە، هەر لەبەر ئەوەی لە کۆمەڵێ تەنگژە دووربکەومەوە.

کە گەڕامەوە بۆ کوردستان، خێزانەکەم ئاگاداری کردم، کە چەند جارێ موختاری گەڕەك لەلایەن معاونی ئاسایشەوە نێرداوەتە سەرمان‌و هەواڵی منی پرسیوە. ئەویش پێی گوتبوون، کە بۆ عیلاج کردن سەفەری کردووە.

موختاری گەڕەکم بینی‌و هەمان دەنگ‌و باسی پێ ڕاگەیاندم. پێم گوت: "ئەوا لێرەم‌و گەر بە پێویستیان زانی دەچمە لایان."

چەند ڕۆژێ تێپەڕی، معاونی ئاسایش موختارەکەی ناردبوو بە شوێنمدا، کە بچمە لایان. لە چاوپێکەوتنەکەماندا ئاگادارم کرد بە ڕێگەدانی خۆیان بۆ عیلاج چوومەتە بولگاریا. پاش ئەوە لە سلێمانی تا مانگی دیسەمبەری ١٩٨١ بە کاروباری خۆمەوە خەریك بووم. هەر لە نێوەڕاستی ئەو مانگەدا لەگەڵ چەند هاوەڵێکدا چووینەوە بۆ بولگاریاو تا نێوەڕاستی مانگی شوباتی ١٩٨٢ لەوێ ماینەوە.

# زیندانیم لە ئەمنی سلێمانی

لە ساڵی ١٩٨٢دا بۆ ماوەی ٨٥ رۆژ لەلایەن پیاوکوژەکانی رژێمی بەعسی فاشیستەوە زیندانی کرام. لە شەوی بیستو نۆی مانگی چوار، رێکەوتی شەوی پێنج شەممەی دەکرد، کە پیاوکوژەکانی ئەمنی سلێمانی هاتنو لە ماڵی خۆمدا گرتیانم.

بە چاوو دەست بەستراوی بردمیانە دەزگای ئاسایشی سلێمانی، ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆریان دام. بە شوێن (عەبدولڕەحمان)ی کوڕمدا دەگەڕان. پێم گوتن: "ئەو ژنی هەیەو ماڵی جودایە."

زۆریان لێکردم ماڵەکەیان پیشان بدەم. پێم گوتن:

"لێمان زویرەو ماڵی خۆی جودا کردۆتەوە، نازانم لە چ گەڕەکێ دەژی."

ئەو شەوە هەر بە جلو بەرگی خەوەوە بردیانم بۆ زیندانی ئەمنی سلێمانی. هەر بە گەیشتنم بۆ ئەوێ، دەستمیان لەپشتەوەو چاومیان بەستەوەو پرسیاری ناونیشانیان لێکردم. دوای ئەوە بردمیان بۆ یەکێ لە ژوورە زیندانەکانی تەنیشتی دەزگای ئەمن، کە پێشتر خوێندنگای ناوەندیی کانێسکان بوو.

ئەو شەوە شەوێکی زۆر سارد بوو، چونکە بارانێکی زۆر دەباری. دوای چەند سەعاتێ، هەستمکرد بووە بە بەیانیو چەند کەسێکی ترم

لهگهڵدا گیراوه. ههر بهو بهیانییه، کهسێ لهوانهی گیرابوون لهگهڵمدا چهند کۆکهیهکی کرد بۆم. دهرکهوت بۆ ئهو کهسه کاك (ئهحمهد عهبدوللا کورده)یه.

ئهشکهنجهیهکی زۆریان دامو ههڕهشهی کوشتنمیان کرد، داوای ئهو ناوانهیان لێدهکردم، که ئیشم لهگهڵدا دهکهن. پێم گوتن: "هیچ کهسێ ناناسمو کهسیش لهگهڵ مندا کار ناکا. گوتیان: "ئاگاداریمان بهدهست گهیشتووه، که تۆ بهرپرسیاری شاریتو چوویتهته ناوزهنگ بۆ لای مام جهلال."

ههرچییان گوت، نهچوومه ژێر باریان. پێم گوتن: "من کاری (مقاولات) دهکهمو ژیانم لهوپهڕی باشیدایهو ههرچیش سهبارهت به من به ئێوه گهیهندراوه، دروستکراوهو له راستیهوه دووره."

هێنده ئهشکهنجه درام تا بێهۆش کهوتم. پاش ماوهیهك هاتمهوه هۆش خۆم، دهبینم له نێوان دووسێ کورسیدا لهژێر زهمینێکدام. کابرایهکی ئهمن هاتو ههندێ ئاوشۆربای کرد بهدهممهوه. زۆری پێ نهچوو یهکێ هاته لامهوهو گوتی: "چۆنی؟ پێمان بڵێ، تۆو مام جهلال نهبوون، هاوڕێی یهك بوون؟"

پێم گوتن: "چاوم بکهنهوه تا بتبینم." پێی گوتم: تۆ ناتوانی. من زۆرم له بهرێوهبهری ئاسایش کردووه تا ریگهی دیتنی تۆی داوه. من

گفتم له بەرێوەبەر وەرگرتووە، كه نەتكوژن. ئەگەر ناوی ئەو كەسانەمان بدەیتێ، كه كاریان لەگەڵتدا كردووە، ئەوا بەرت دەدەن."
لەوەڵامدا پێم گوتن: "نەكەس دەناسم‌و نه لەگەڵ كەسیشدا كار دەكەم." ئەویش گوتی: "كەوا بێ تۆبالی خۆت به ملی خۆت."
ئەو شەوە ئێمە، كه گیراین ژمارەمان هەشت كەس بوو. دوای ئەوەی، كه بەیانی بوو، كاتی دەوام دەستیپێكرد، ئەمنەكان هاتن‌و پرسیاری ناوەكانیان لێكردین. بۆم دەركەوت ئەو كەسانەی لەپاڵمەوە بوون گیرابوون. شەو هەموو وەكو من له ماڵی خۆیان گرتبوونیان. گیراوەكان، بێجگه له كاك ئەحمەد عەبدوڵلا كوردە، مامۆستا رەحیم رەمەزان‌و كاك كەمال تاهیری برای شەهید مامۆستا جەمال تاهیرو كاك ئیسماعیل، كه فەرمانبەر بوو ئەو كاتەو كاك جەلال، كه فەرمانبەر بوو له تەندروستیی سلێمانی‌و كاك كەریم رەفیق، كه قوتابی بوو له ئامادەییی پیشەسازیی سلێمانی‌و كاك مەولود بوو.
كه كاتی دەوام دەستی پێكرد، هێندەی نەبرد كەسی نۆهەمیان هێنا بۆ لامان. كه پرسیاری ناویان لێكردەوە، بۆم دەركەوت ئەویش كاك قادر مەنمی بوو، كه فەرمانبەر بوو له بانقی سلێمانی. هەر ئەو بەیانییه لەبانق گرتبوویان.
هەر هەمووومان دەست‌و چاومان بەسترابوو. ئەو رۆژە ئێمەیان خستە ژوورێكی بەتاڵ، تەنها هەندێ كورسیی خوێندنی خوێندنگاكەی تیابوو.

هەرچەند ئەو کاتە کاتی سەرماو سۆڵە نەبوو، بەڵام وا ڕێکەوت بوو ئەو چەند ڕۆژە بارانی زۆر دەباری‌و هەواش سارد بوو.

هەر ئەو شەوەی کە گیرام، لە بەرەبەیانەوە تا دەمەو نیوەڕۆ چەند جارێ بردمیانە حەوشەی خوێندنگاکەو بە (کێبڵ)و دارزۆریان لێدام‌و داوای جێگاو ماڵی شەهید (عەبدولڕەحمان)ی کوڕمیان لێدەکردم. منیش هەر دەمگوت نازانم. ئیدی زۆریان لێدەدام‌و بێهۆشیان دەکردم‌و هەر جارێ تەنەکەیەك ئاویساردیان دەکرد بەسەرمدا، هەوڵیان دەدا هۆشم بێتەوە بەر.

لەو شەوەدا، کە گیراین، تا چەند ڕۆژێ هیچ خواردنیان نەداینێ. لەدوای چەند ڕۆژی خۆراکێکی زۆر کەمیان داینێ، پێکهاتبوو لە دوو سەموونی کۆن‌و ڕەقەوەبوو لەگەڵ شلەی کوولەکەیەکی تاڵی زۆر ناخۆش. بەڕاستی زۆریان برسی کردین. مەبەستیشیان هەبوو لەوەی برسیمان بکەن. زۆر خراپ لەگەڵماندا هەڵسوکەوتیان دەکردو زۆر دڕندانە پەلامارو ئازاریان دەداین. ئەو کاتانەی دەیانویست لێپرسینەوەو لێکۆڵینەوەمان لەگەڵدا بکەن، بەزۆری دوو ماوەو کاتی زۆر نالەباریان هەڵدەبژارد. کاتی یەکەمیان دەمەوئێوارەیەکی درەنگ یان کاتی نیوەشەو. ئیتر بەم شێوەیە چەند ڕۆژێ ماینەوە.

نیوەشەوی ڕۆژی ٥/٩ بوو، شەوی یەکشەممە بوو، دەوروبەری کاتژمێری یەکی نیوەشەو بوو. لەپڕ گوێمان لە دەنگ‌و ترپەی پۆستاڵ بوو، کە

دیاربوو تەحیەیان بۆ کەسێ دەکرد دیاربوو لێپرسراوێکی گەورەی ئەمنی ئەو سەردەمە بوو.

هەندێکی پێنەچوو دەنگی ئەو خەڵکە بەرەو لای ژوورەکەی ئێمەوە هات. کاتێکمان زانی دەرگای ژوورەکەی ئێمەیان کردەوە، کۆمەڵێ خۆیانکرد بە ژوورەکەدا. ئێمە هەموو دەستو چاومان بەسترابوودوە، تەنها گوێمان کاری دەکرد. هێندەی پێنەچوو لێپرسراوەکە بە دەنگێکی زۆر زڵو ناخۆش داوای لێکردین ماوەی یەك چارەکمان بۆ دادەنێ بۆ ئەوەی، کە چی دەزانین بیڵێین ئەگینا ئیعداممان دەکەن. هەروەها پێی گوتین ئاگامان لەوە هەیە، کە ئێوە هەموو شتێکن لەنێو شاری سلێمانیو پەیوەندیتان بە تێکدەرانەوە هەیە. کابرا ئەمانەی بە عەرەبی پێ گوتین، بەڵام کەسێ لەو کۆمەڵەی لەگەڵیدا هاتبوو، کە دوایی بۆمان دەرکەوت ئەویش کەسێکی خۆفرۆش بوو ناوی (نەقیب مەدحەت) بوو قسەکانی کابرای بۆ دەکردین بە کوردی. ئیتر جێیان هێشتین. هێندەی پێ نەچووهەمان کۆمەڵو هەمان لێپرسراو هاتنەوە ژوورەکەمان. لێپرسراوەکە گوتی:

"ها چی دەڵێن، پێمان دەڵێن یان ئیعدامتان بکەین؟"

کەس لە ئێمە وڵامی نەدایەوە، تەنها من نەبێ. گوتم:

"من هیچ نازانمو پەیوەندیم بە هیچ شتێکەوە نییە، هەرچیشم لەگەڵ دەکەن دەسەڵاتمان نییە."

هەر لەبەر ئەوە، هێندەی پێنەچوو، دەستیاندایە بن باڵمان‌و هەڵیانساندین‌و بردینیان بەرەو حەوشەی پشتەوەی خوێندنگاکە. لەوێ هەستمان کرد ژمارەیەکی زۆر لە پیاوکوژەکان وەستاون‌و چەند ئوتومبێلێکیان وەستانبوو. بە دەنگەکە ناسیمانەوە، کە پیاوکوژ (مولازم موحسین)یشیان لەگەڵدایە. ئێمەیان هەموو خستە نێو ئوتومبێلێك‌و هەستمانکرد لەنێو قافڵەیەکی ئوتومبێلی زۆردایین. دوای ماوەیەك، کە بە ئوتومبێلەکە بردینیان، ئیتر هەموو ئوتومبێلەکان وەستان. ئێمەیان داگرت. دیاربوو کۆمەڵێکی زۆر لە پیاوکوژەکانی (بەعس)مان لەگەڵدایە.

کاتێ کە دایانگرتین، هەستمان بە هەوایەکی سارد کرد. گوێمان لە قیڕەی بۆق‌و زەڕینی کەر بوو. بۆمان دەرکەوت ئەو شوێنەی ئێمەیان بۆ هێناوە دەشتە. یەکێکە لە دەشتەکانی دەوری شاری سلێمانی.

یەکێ لە برادەرانەمان، کە ئەویش مامۆستا (رەحیم رەمەزان) بوو، بە رێکەوت پەڕۆکەی سەرچاوی باشیان نەبەستبوو. لە بەشی خوارەوەی چاویەوە توانی بەسەرهاتی ئەو شەوەمان ببینێ. دوای ماوەیەك، کە گەڕاینەوە بۆ هەمان ژووری پێشوومان، لەنێو ئەمن، زۆر بە دزییەوەو بە پچڕپچڕ دیمەنەکانی ئەو شەوەمان بۆ بگێڕێتەوە. ئەوەش بەم شێوەیە بوو:

دوای ئەوەی دایانگرتین لە ئوتومبێلەکە لەسەر شێوەی ( L ) رایانگرتین. هەروەها چەند کەسێکی گیراوی تریشیان لەگەڵدا هێنابووین. ئەو شەوە هەموومان بەیەکەوە بووین. دوای ئەوە یەکەیەکە دەیانبردین بۆ لای کۆمەڵە کەسێکی دوورتر لە ئێمە وەستابوون. دیاربوو ئەوان وەکو لیژنە وابوون.

کاتێ کە منیان برد، داوایان لێکردم، کە چی دەزانم‌و پەیوەندیم بە کێوە هەیەوەو کێ پەیوەندیی بە منەوە هەیەو پلەی لێپرسراویم چییە بیلێم. ئەگەر نەیلێم، ئەوا ئەو شەوە ئیعدامم دەکەن. منیش پێمگوتن هیچ نازانم‌و پەیوەندیم بە کەسەوە نییەو کاری سیاسی ناکەم. ئیتر پێیانگوتم شایەتمان بهێنم. بردیانمەوە جێگای خۆم. بە هەمان شێوە هەموو برادەرە گیراوەکانی، کە لەگەڵمدا بوون، ئەو شەوە بردیان‌و وەکو من ئەو داوایانەیان لێکردن. بەڵام زۆر ئازایانەو پاڵەوانانە هەموو خۆیان راگرت‌و کەس هیچی نەگوت. بۆیە ئەو فاشیانە ئەو شەوە زۆر دڕندانە پێنج یان شەش کەسیان لێ رەمی کردین‌و شەهیدیان کردن‌و ئێمەشیان هێشتەوەو شێوەی شەهیدکردنەکەشیان بەم شێوەیە بوو، کە مامۆستا رەحیم بۆی گێڕاینەوە.

بەڵام ئەوەی بە گوێ هەستمان پێدەکرد، هەموویمان گوێ لێبوو، ئەوی تریش، کە بەچاو بینرا دوایی مامۆستا رەحیم بۆی باسکردین.

ئەوەی ئەو شەوە بە گوێ بیستمان ئەوەبوو، کە ئەو قارەمانانە بە چەکێکی بێ دەنگ شەهیدیان دەکردن. ئێمە تەنها گوێمان لە تەپەی فیشەکەکە دەبوو، کە پێیان شەهید دەکردن. دوای ئەوە گوێمان لە تەپەی لەشیان دەبوو، کە دەکەوتە سەر زەوی‌و گوێمان لە پڕخەپڕخیان دەبوو، چونکە دەمی هەموومانیان زۆر بە توندی بەستبوو، بۆیە شەهیدەکانیش تەنها دەنگیان بە پڕخە دەبیسترا.

بەڵام ئەوەی بە چاو ئەو برادەرەمان بینی، ئەو شەوە دوایی بۆی گێڕاینەوە، بەم شێوەیە بوو: ئەو کەسەی شەهیدیان دەکرد، تەنها یەك فیشەکیان دەنا بە سەریەوەو ئیتر شەهید دەبوو. بەڵام تەنها یەکێ لەو قارەمانانە بەو فیشەکەی سەری شەهید نەبوو، یەك فیشەکی تریان نا بە دڵیەوە. بەم شێوەیە ئەو شەوە هەموویان شەهید کردن. دوای ئەوە ئێمەیان هێشتەوەو بردینیان بۆ شوێنی خۆمان.

ئێمەیان بۆ ماوەی ٨٥ رۆژ لە زینداندا هێشتەوە. ئەو ماوەیە زۆر بە دڕندانە هەڵس‌و کەوتیان لەگەڵدا دەکردین. ئەو ماوەیەی ئێمە گیرابووین، خەڵکێکی زۆری تریان گرتبوو، زۆربەیان قوتابیی خوێندنگاکانی ناوەندی‌و ئامادەیی بوون لە کوڕ کچ. زۆر بێ ویژدانانە ئازارو ئەشکەنجەی ئەو خەڵکەیان دەدا. بۆ ئێمە ئەوە زۆر ناخۆش بوو، کە گوێمان لە هاوارو قیژەی ئەو ئافرەت‌و کچانە دەبوو، مردنمان بە ئاوات دەخواست بۆ خۆمان.

ماوەیەکی زۆر لەنێو ژوورێکی تایبەتی نێو خوێندنگاکەدا مابنەوەتێکەڵی کەسیتریان نەکردین تا رۆژی ١٤/ ٧/ ١٩٨٢. ئیتر بردینیانە نێو بەڕێوەبەرێتیی ئەمن لە تەنیشت زیندانەکەوە. لەوێ دەوروبەری نیوەڕۆ بوو، ئێمەیان هاویشتە نێو زیندانەکەی ئەوێ. کە چووینە ژوورەوە چاویان کردینەوە. سەیرمانکرد کەسێکیتری لێ نییە تەنها هەر ئێمە بووین. دوای نیوەڕۆی هەمان رۆژ نزیکی کاتژمێری چواری دوای نیوەڕۆ دووکەسیتریان هێناو کردیانە لای ئێمە. ئەو دوو کەسەش یەکەمیان مامۆستا جەمال تاهیر بوو، دووەمیان کاك عەزیز مەحمود بوو، کە ئێستا ناسراوە بە (حاکم عەزیز).

ئیتر بەم شێوەیە ژمارەمان بوو بە یانزە کەس. ماینەوە لەوێ تا رۆژی ٧/٢٢ ریکەوتی رۆژی پێنجشەممەی دەگرد. ئەو رۆژە پێیانگوتین ریشمان بتاشین‌و بەرمان دەدەن. هەر ئەو رۆژە، لە دەوری نیوەڕۆدا هاتن‌و بردیانین بۆ لای بەڕێوەبەری ئەمن. لەوێ دایاننایین لای بەڕێوەبەر خۆی‌و داوای چایان بۆ کردین.

من لە سووچێکی ژوورەکەدا دانیشتبووم. کەسێ لە بەردەمی من دابوو، دەمزانی ئەو کەسە مامۆستا جەمال تاهیرە، بەڵام نەمدەوێرا قسەی لەگەڵدا بکەم.

بەڕێوەبەری ئەمن دانیشتبوو، کەوتە قسەکردن لەگەڵماندا. گوتی:

"ئێمه ئاگامان لەوە هەیە، کە ئێوە هەموو شتن لەم شارەو کاری سیاسی دەکەن لەگەڵ تێکدەرەکاندا."

رووی کردە مامۆستا جەمال تاهیرو پێی گوت:

"تەزانەت دەشزانین، کە ناوی نهێنیی تۆ (سەرکەوت)، بەلام هیچمان لە ئێوە ناوێ بۆمان بکەن، تەنها ئەوەندەمان لە ئێوە دەوێ بڕۆنە نێو ماڵو منداڵی خۆتانو دانیشن بۆ خۆتانو ماڵو منداڵتان بژین. ئێوە لەسەر بڕیاری بەرێز سەرۆك بەربوون، چونکە لێبوردنی گشتیی بۆ هەمووتان دەرکردووە. ئەگەر وا نەبووایە، ئێمە هەرگیز ئێوەمان بەرنەدەدا."

وەکو بڵێ بەداخەوە لە دەسەلاتی ئێمەدا نییە.

ئەو رۆژەی ئێمە لە زیندان هاتینە دەرەوە رۆژی پێنجشەممەی ٢٢/٧/١٩٨٢ بوو، کە رێکەوتی جەژنی رەمەزان بوو.

بەهەرحاڵ، من هەر دوو رۆژ لە (سلێمانی) مامەوە. لەو دوو رۆژەدا مامۆستا جەمال تاهیرم بینیوە، زۆر تکام لێکرد، کە بچینە دەرەوە. بەلام لەبەر کۆمەڵێ کێشەی خێزانی ئەو دواکەوتو من چوومە دەرەوە، ئەویش دوای دوو مانگ هاتە دەردوە بۆ ناوزەنگو کرا بە ئەندامی سەرکردایەتی.

# چوونه‌وه‌م بۆ شاخ

دوای به‌ربوونمان، له دوای نێوەڕستی مانگی (ئاب)ه‌وه له‌سه‌رکردایه‌تیه‌وه ئاگادار کراینه‌وه، که بچینه ده‌ره‌وه نه‌با سه‌رله‌نوێ بمانگرنه‌وه. منیش له‌گه‌ڵ (عه‌بدولڕه‌حمان)ی کوڕم، که تا ئه‌و کاته خۆی شاردبووه‌وه، هه‌روه‌ها له‌گه‌ڵ (ئه‌رسه‌لان)ی کوڕم سه‌روه‌ت‌و سامانم جێ هێشت‌و چووینه‌وه چیاکانی کوردستان.

چوومه زه‌ڵێ بۆ مه‌کته‌بی سیاسیی یه‌کێتیی نیشتمانیی کوردستان. له گه‌یشتنه‌که‌م ئاگاداری (مام جه‌لال)یان کردو ئه‌ویش هات بۆ لام. ماوه‌ی دوومانگێ له‌وێ بووم. پاشان سه‌رکردایه‌تی یه‌کێتی بڕیاریدا چوار مه‌ڵبه‌ند له کوردستان دابمه‌زرێنن.

به بڕیاری سه‌رکردایه‌تیی یه‌کێتی کرامه به‌رپرسی عه‌سکه‌ریی مه‌ڵبه‌ندی یه‌ك له (حاجی مامه‌ند)و به‌رپرسی سیاسیش (مه‌لا به‌ختیار) دانرا. هه‌رچه‌نده مه‌لا به‌ختیار ڕێزی تایبه‌تی بۆ من داده‌ناو له هه‌موو ئیش‌و کاره‌کانماندا، ته‌نانه‌ت بۆ هه‌ر جێیه‌ك بچووینایه به‌یه‌که‌وه‌و به زۆریش پێش خۆی ده‌خستم، به‌ڵام له‌و کاتانه‌دا ده‌نگی دروستبوونی ئاڵای شۆڕش له‌نێودا هه‌بوو، که ئه‌م یه‌کێ بوو له ئه‌ندامه سه‌ره‌کیه‌کانی‌و کاری نهێنیان ده‌کرد. دیارده‌ی ئه‌وه هاته‌کایه‌وه، که جووڵانه‌وه‌یه‌ك له پشت یه‌کێتیه‌وه هه‌یه‌و کاری بۆ ده‌که‌ن. وای لێهات،

کە خەریك دەبوو بە ئاشکرا دژایەتیی هەموو باڵەکانی نێو یەکێتی بکەن، چەندین بڵاوکراوەی جۆربەجۆریان بڵاودەکردەوەو چەند کەسیشیان بەلای خۆیاندا راکێشا. لە راستیدا من بەم کارانە زۆر دلگران بووم، چونکە ئەوە بووە هۆی ئاژاوەو گێرەشێوێنی.

(مەلا بەختیار) ئەو کاتە هەڵسوکەوتی گۆڕابووو کارەکانی وەك لێپرسراوی مەڵبەند بە چاکی بەڕێوە نەدەبرد، ئەوەش کاری خراپی دەکردە سەر ئیش‌و کاری مەڵبەندەکەو منیش وەك هەست بە لێپرسینەوەیەك بۆ ئەم دیاردەیە ئاگادارییی سەرکردایەتیم کردەوە، کە من لەگەڵ ئەم پیاوەدا رێك ناکەوم‌و بەیەکەوە ناکرێ لە یەك مەڵبەندا بین. هەر بۆیە بانگکرامە سەرکردایەتی‌و لەوێ مامەوە تا بەهاری ۱۹۸۳، کە لە کۆنگرەی شۆڕشگێڕاندا بە ئەندامی سەرکردایەتی هەڵبژێردرام‌و لە دێی (سوێرە) بارەگام دانا.

# شەڕی پارتیزانیی شۆڕشی نوێ

مانگی ئەیلوولی ساڵی (١٩٨٢) بڕیاردرا کەوا ناوچەکانی چالاکیی پێشمەرگایەتیی لە کوردستان بکرێ بە چوار مەڵبەندەوە، مەڵبەندی یەكو دووو سێو چوار. ئەوکاتە منیان دانا بە لێپرسراوی پێشمەرگایەتیی مەڵبەندی یەك.

مەڵبەندی یەك سنووردکەی لە ماوەتەوە بوو تا چوارتاو پێنجوێنو هەڵەبجەو هەورامانو قەرەداغ. پێش ئەوەی دەستبەکاربم، لەو مەڵبەندەدا داوام لە بەڕێز (مام جەلال) کرد کەوا مۆڵەتم بدا بچمە قەرەداغو هەندێ خزمو دۆستو کەسو کار هەیە بەسەریان دەکەمەوەو لە نزیکیشەوە ماڵو منداڵ دەبینمو جێگەو ڕێگەیان لە شوێنێکی گونجاودا بۆ دابین دەکەم. پاشان چوومو سەردانی چەند لایەکم کردو ماوەیەك لەنێو قەرەداغو دێهاتەکانی دەوروبەریدا مامەوە. لە گەڕانەوەماندا لە ناوچەی تانجەرۆی سەر بە ناوچەی قەرەداغ ئێوارە ویستمان نزیکی جادە ببینەوە. لە دەوروبەری کاتژمێر چوارونیو هەوڵماندا بچینە سەر جادەی قیرتاوی سلێمانیو عەربەت تا دەستێ لە پیاوەکانی ڕژێم بوەشێنین.

زۆربه‌ی زۆری کاته‌کانی ئێواران، له‌دوای بانگی عه‌سره‌وه، نێوان کاتژمێر چوارو پێنج، له به‌رژه‌وه‌ندیی پێشمه‌رگه بوو، چونکه شه‌وی به‌سه‌ردا ده‌هات‌و له حکومه‌ت نه‌ده‌ترساین، حسابی ئه‌وه‌مان ده‌کرد حکومه‌ت فریای ئه‌وه ناکه‌وێ هێز بهێنێته سه‌رمان‌و ئه‌گه‌ر بیشیهێنێ ئه‌وا ده‌توانین بۆ ماوه‌ی کاتژمێرێ تا کاتژمێرو نیوێ شه‌ڕ بکه‌ین.

کاتژمێر (٥)ی ئێواره له گوندی (یه‌خی ماڵی) دوو کیلۆمه‌تر له جاده‌ی قیره‌وه دووره، واته نزیکی عه‌ربه‌ت، (عه‌بدولره‌حمان)ی کوڕم له‌گه‌ڵ (شێخ زاهیر)و (حداد)یش پێش ئێمه که‌وتن بۆ ئه‌وه‌ی. له جێگه‌ی چایخانه کۆنه‌که‌ی (حاجی سه‌مینی خه‌راجیانی) بۆسه دابنێین، ئه‌وان که‌وتنه‌ڕێ به‌ره‌وئه‌وێ، کاتژمێر پێنج‌و نیوی ئه‌و ڕۆژه، ئه‌وه‌بوو ئۆتۆمبیلێکی لاندکروزه‌ر که‌وته نێو بۆسه‌که‌وه، که [illegible]) بوو، چوار چه‌کداری تێدا بوو به دیلی که‌وتنه ده‌ستمان. به په‌له چه‌که‌کانمان لێسه‌ندن‌و باڵمان به‌ستن.

من‌و کاك دلاوه‌ری ئه‌حمه‌د مه‌جیدو سێ پێشمه‌رگه‌ی‌تر به ئۆتۆمبیله‌که له‌گه‌ڵ دیله‌کاندا ڕۆشتین بۆ (خه‌راجیان)و (عه‌بدولره‌حمان‌و شێخ زاهیرو حدادو شیهاب)یش، ئه‌وان به پێ هاتن، بۆ پاراستنی ئێمه ئه‌وان دواکه‌وتن، هه‌مووومان کاتژمێر شه‌شی ئێواره گه‌یشتینه ناو خه‌راجیان، داوامان له خه‌ڵکی گونده‌که کرد هه‌ندێ نان‌و دۆیان بۆ هێناین، به‌ڵام خه‌ڵکی گونده‌که داوایان لێکردین بڕۆین‌و

گوندەكە جێبهێڵین، چونكە گوندەكە تەنها ٢كیلۆمەتر لە (عەربەت)ەوە دوور بوو، كە بارەگای لیوای لێبوو. ئێمەش بۆ ئەوەی ئەوان تووشی گرفت نەكەین، بە بەرچاوی سەربازگەكەوە بە ئۆتۆمبیلەكە چووین بە دیوی (دوكانیان)دا، نیوەمان بە پێو نیوەشمان بە ئۆتۆمبیلەكە. لەو چالاكییەدا برای بەڕێز كاك (دلاوەر ئەحمەد مەجید)مان لەگەڵدابوو.

كاتێ هەواڵ گەیشتە (مقر لیوا)ی (عەربەت)، ئیتر دێهاتەكانی دایە بەر تۆپ. دوو (مدرعە)ش بە جادەكەدا لێمان نزیكبوونەوە. پاش چەند تەقەكردنێ گەڕانەوە. ئێمەش ئۆتۆمبیلەكەو دیلەكانمان بۆ (گورگەدەر) ناردو خۆمان مایەوە بۆ بەرگری. تاریكی داهاتو كەوتینەڕێ بەرەو (گورگەدەر). ئەو شەوە لەوێ مایەوە لای خواڵێخۆشبوو (جەزای كەوێ). بەیانی زووش بە تاریكو لێڵی دەرچووین بەرەو (پلارەزان). گەیشتینە نێو (پلارەزان)، خەڵكی ئەوێ زۆر بە گەرمی بەرەوپیرمان هاتنو دەست خۆشییان لێكردین. ئەوكاتە جێگەمان هێشتا دیاری نەكردبوو بۆ مەڵبەندی یەك، هەرچوار چەكدارەكەم لە لای خۆم بەندكرد بۆ ماوەی سێ مانگو دوایی لەسەر داوای زۆری دۆستەكانمان بە كەفالەت بەرەڵامان كردن.

# برینداربوونی عەبدولڕەحمان

من ماوەیەکی کەم لە گوندی (ناوزەنگ) لای (مام جەلال)و مەکتەبی سیاسیدا مامەوە. لە دواییدا لە پاییزی ساڵی ١٩٨٢ بووم بە لێپرسراوی عەسکەری مەڵبەندی یەك.

چوومە گوندی (پاڕەزان)، خانوویەکم پێکەوە نا بۆ ئەوەی ماڵو منداڵەکەم بەرمە ئەوێ. ماوەی دوو هەفتە لەوێ بووم. (عەبدولڕحمان)ی کوڕم پێشتر، پەیوەندیی بە کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە هەبووو بەرپرسیاری پێشمەرگەی ناوشار بوو. رۆژێ پێی گوتم:

"کاکە حەمە ئیجازەم بدەرێ لەگەڵ بەڕێز کاك (مەلا بایز)[2] بچین بۆ نێوشار دەستێ بوەشێنین." منیش پێم گوت:

"پەلە مەکە لەو کارانە، کاری نێوشار بە تۆ ناکرێ. خەبەر بدە بە پێشمەرگەکانی نێو شار با ئەوان بیکەن، چونکە تۆ ناسراویو فەرمانی گرتنت هەیە."

ئەویش زۆری لەگەڵدا گوتم. گوتی: "کارێکیان بۆ دیاری کردووین لە لایەن رێکخستنی نێوشارەوە، پێم خۆشە بۆ یەکەم جار خۆم بیکەم.

---

[2] ئەو کاتە (مەلا بایز) ئامر کەرت بوو لای من.

کارەکەش ئەوەیە نانەواخانەیەك هەیە لەبەردەم مزگەوتی (عەبدوللا لوتفی)، هەموو بەیانیەك دوو عەسکەری قوە خاصە لە قومتەکەی (مولازم موحسین)ی تاوانبار دێنە بەردەم ناناواخانەکە، سەعات شەشی بەیانی، تەعەدا لە ئافرەت دەکەن. جا داوات لێدەکەم، کە ڕیگەم بدەی بڕۆم لەگەڵ (مەلا بایز). چەکی قورس لەگەڵ خۆمان نابەین، یەکی دەمانچەیەکمان پێ بێ دەتوانین ئەو کارە ئەنجام بدەین."

منیش ڕیگەم پێدان لەگەڵ (مەلا بایز) ڕۆشتن. چوونە ماڵی خزمێکی خۆمان، کوڕەکانی خاڵۆ (مەلا عەزیز) لە سەرچنار. بۆ ڕۆژی دوایی چوونە بەردەم نانەواخانەکەی لای مزگەوتی (عەبدوللا لوتفی). کاتژمێری (٥)ی بەیانی. پاش ماوەیەکی کەم عەسکەرەکان هاتبوون. ئەوانیش قەراریان دابوو هەوڵ بدەن تەقە نەبێ لەو شوێنەدا، چونکە لە مەقەڕەکەی (مولازم موحسین)ی تاوانبارەوە زۆر نزیکە. ئینجا ڕۆیشتن بەرەو عەسکەرەکان‌و پێش ئەوەی بگەنە لایان، ئەوان ئیحتیاتی خۆیان کردبوو، کە ئەو دووانە بەرەو ڕوویان دەچن. وەکو باسیانکرد، عەسکەرەکان تفەنگێکیان بەدەستەوە بوو، یەکێکیان لاواز بوو، ئەوی‌تریان قەڵەو. بڕیاریان دابوو هەریەکەیان پەلاماری یەکێکیان بدەن، بێ ئەوەی تەقە بکەن. (عەبدولڕەحمان) پەلاماری قەڵەوەکەی دابوو. (مەلا بایز)یش بۆ لاوازەکە. پاش بەیەکدا هاتن‌و شەڕە بۆکس‌و شەق‌و یەکتردان بە زەویداو هەستا نەوە، بە ناچاری ئەو قەڵەوەیان

کوشتو تفەنگەکەیان بردن. بەڵام لاوازەکە بێ چەك رایکردو لە ماوەیەکی کەمدا جەماعەتی (مولازم موحسین) گەیشتنە سەریانو شەڕ لە نێوان هەردوو لادا دەستی پێکرد. لە ئاکامدا دوو سەربازیتر کوژانو (مەلا بایز)یش شەهید بوو. زۆر بەداخەوە. (عبدولرەحمان) دوو گوللە بەر قۆڵیو پەنجەی کەوت. لە رێگەی دۆستێکی دڵسۆزەوە گەیاندیانە گەرەکی خەبات، هەردوو چەکەکەشی بەدەستەکەیتر هەڵگرتبوو.

لەو چالاکییەدا زۆر مرۆڤی نیشتمانپەروەر لەو کاتە نارەحەتەدا یارمەتیی (عەبدولرەحمان)یان دابوو، بەڵام بەداخەوە، جەنازەی (مەلا بایز) جێ ما. دوای نەشتەرگەریو تیمارێکی سەرەتایی، کە بۆ (عەبولرەحمان)یان کرد، بەرێیان کرد بۆ دێی (هەناران) بە تراکتۆر بۆ ماڵی برای خۆشەویستم کاك (کوێخا حسێنی هەناران)، کە پیاوێکی تێکۆشەرو دڵسۆزی گەلەکەمان بوو، ئەویش بە کورەکانی خۆیدا ناردی بۆلامان بۆ دێی (پارەزان). ماوەیەکی زۆر لەژێر چارەسەردا بوو بەو توانا کەمەی، کە هەبوو، بەڵام دەستی سەقەت بوو. زۆر کەس ئاگاداری ئەم رووداوە گرنگەو دڵتەزێنە بووە.

لەگەڵ دەیان کارەساتی ناخۆشو دڵتەزێنیترا شەهید (عەبدولرەحمان) لە نێوان ساڵەکانی ١٩٧٧- ١٩٧٨دا زۆرجار لای من باسی ئەوەی دەکرد، کە بچێتە شاخ، بەڵام من زۆر جار پێم دەگوت: "ئێمە لێرە زیاتر دەتوانین یارمەتیی شۆڕشەکەمان بدەین، کۆمەڵێ کاری باش ئەنجام بدەین." ئەو

به خۆی‌و ئۆتۆمبیله‌که‌یه‌وه شه‌وو رۆژ هه‌ر خه‌ریکی ئه‌نجامدانی کاروباری شۆرش بوو.

سه‌بارەت به شه‌هید (مه‌لا بایز). به‌راستی پێشمه‌رگه‌ی زۆر ئازاو دێرینم له‌ده‌ست داوه، به‌لام که‌م هه‌بوو وه‌ك ئه‌و قاره‌مانه بووبێ. چونکه به‌راستی ئه‌ویش یه‌کێ بوو له‌و پێشمه‌رگه خۆنه‌ویستانه‌ی هه‌موو ژیانی خۆیان بۆ رزگاری‌و ئازادیی کوردستان ته‌رخان کردبوو. پیاوێکی ده‌ست پاك‌و داوێن پاك‌و راستگۆو لێهاتوو بوو.

شه‌هید عه‌بدورله‌حمان حه‌مه‌ی فه‌ره‌ج (سالی ۱۹۸۰ – گه‌لی عه‌لی به‌گ)

# نامەکانم بۆ حەمەی حاجی مەحمود

لەهەر کاتێکدا دەرفەتێکم بۆ ڕێکەوتبێ درێخیم نەکردووە بۆ تەبایی‌و یەکبوونی خەڵکی کوردستان بێ جیاوازی بیروباوەڕیان. ئەوەندەی لە توانامدا بێ دژی شەڕی براکوژی‌و کورد دژی کورددا وەستاومەتەوەو هەوڵم داوە بە ئاشتی‌و لە ڕێگای ووتووێژو دانوسانەوە کێشەکانی نێوان باڵەکانی کوردایەتی نەمێنێ‌و هەرگیز نەگاتە یەکتری کوشتن‌و لەنێوبردنی. بۆ ئەم هەڵوێستەم بەڵگەی زۆرم هەیەو ئەوانەی لەگەڵمدا کاریان کردووە، ئەوە بەباشی دەزانن. بۆ نموونە، لەساڵی ١٩٨٢-١٩٨٣دا چەند نامەیەکم بۆ کاکە حەمەی حاجی مەحمود گولەخانەو کاك بەهادین نوری‌ی سکرتێری حزبی شیوعی‌ی ئەو کاتەو کاك عبدولخالق هەورامی‌و دکتۆر مەحمودو کاك رەسول مامەندو کۆمەڵێ برادەری دیکە دەربارەی تەبایی‌و برایەتی‌و ڕێبازی کوردایەتی نووسیوە. هەروەها گەڕان بەدوای چارەسەرێکی گونجاودا بۆ چارەسەری کێشەکانمان. بەڵام داخەکەم، نە ئەو نامانەو نە وەڵامەکانیانم لا نەماوە. چەند نامەیەکم لە کتێبەکەی کاکە حەمەی حاجی مەحموددا بڵاو کراونەتەوە، هەرچەندە زۆر لەوانەش زیاتر بوون، کە بۆ کاکە حەمەم نووسیون. وا منیش لەبەر کتێبەکەی ئەودا جارێکی دی دەیانووسمەوە.

## یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان
## مەڵبەندی یەك
## بەشی عەسکەری

**بۆ/ برای بەڕێز کاکە حەمەی حاجی مەحمود**

**سلاوێکی برایانەی گەرم. بە هیوای شادبوونەوەین بە یەك.**

برای بەڕێز.. من کە هاتم بۆ شارەزوور حەزم کرد چاوم پێت بکەوێ، بەلام بەداخەوە چاوم پێت نەکەوت لەبەر ناتەواوی و ناڵۆزی وەزعەکە. هەرچەندە برادەرێکی دۆستی خۆمانم نارد بۆلات بۆ ئەوەی، کە جارێکی‌تر خۆت تووشی شەڕی لابەلا نەکەیت لەگەڵ یەکێتی‌دا. منیش سوپاست دەکەم، کە بەشداریت نەکرد لەم شەڕە ناڕەوایەدا، چونکە تۆ ئینسانێکی دڵسۆزو خۆشەویست بوویت لەناو یەکێتی‌دا. ئێستاش زۆربەی زۆری برادەران باست ئەکەن و خۆشیان ئەوێیت، بە تایبەتی هەڤاڵی بەڕێز مام جەلال.

ئێستاش داوات لێ ئەکەم، کە بۆ بەرژەوەندیی گشتی بیر لە برایەتی‌و هاوخەباتی بکەیتەوە شان بەشانی یەکێتی نیشتمانی. جا منیش وەکو مەسئولێکی عەسکەریی مەڵبەندی یەك ئامادەم بۆ هەموو پشتگیریەکت، چونکە تۆ کوڕێکی دڵسۆزو باش بوویت‌و ئێستاش مەجال هەیە بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیەی، کە هەبووە. جا بۆیە من پێم خۆشە بە زووترین کات چارەسەری کێشەکان بکەین‌و بگەڕێیتەوە بۆ ریزی یەکێتیی نیشتمانی. ئەگەر پێشت خۆشە یەکتر ببینین، ئەوا شوێنێکی ئەمین‌و باش دابنێیت، کە بگونجێت بۆ هەردوو

لامان تاوەکو باسی کێشەکان و داهاتوو بکەین. ئەگەر خۆشت نەهاتی، ئەوا کاک عبدولخالق، یان هەر برادەرێکی باوەرپێکراوی خۆت بنێریت بۆلام با جوابەکەیم بداتەوە بۆ ئەوەی بزانم داواکاریەکانت چین، چونکە من لەلایەن بەڕێز مام جەلالەوە تخویل کراوم بۆ ئەوەی کۆتایی بەو کێشەیە بهێنین و چارەسەری بکەین. سلاحیاتیشم هەیە، کە وەکو سەرتیپێك لە شارەزوور داتبنێم. جا دووبارە داوات لێدەکەم، کە خۆت تووشی شتی لابەلا نەکەیت، چونکە ئێستا چارەسەری کێشەکان بە ئاسانی دەکرێت و منیش ئامادەم هەموو یارمەتییەکت بدەم و پشتگیریت بکەم وەکو برایەکی دڵسۆز و هاوخەبات و هاوسەنگەر لە ریزی یەکێتی نیشتمانیدا.

برام، لای ئەو برادەرەی، کە ناردبووم بۆلات گلەیت کردبوو، کە گوایە من قسەم پێ وتوویت و هەڕەشەم کردووە. بەلام من ووتومە، کە ئەو دیلانە بێ تاوانن و ئاگاداری هیچ شتێك نین. جا منیش لەو کاتەی، کە هاتوومەتە دەرەوە، پێش ئەوەش رەئم وا بووە، کە هەموو ناکۆکی و کێشەیەك بە ووتووێژ چارەسەر بکرێت. چونکە هەرلایەك بە ناوی کوردایەتی و وەتەنیەتەوە قسە ئەکات. جا بۆیە من وا بیر ئەکەمەوە، کە هەموو گیروگرفتەکانمان بە هێمنی و برایانە چارەسەر بکەین. چونکە تۆش زۆر هەوڵت داوە و هیلاك بوویت لەگەڵ ئەکێتیدا.

ئیتر لە کۆتایی دا زۆر سلاوم بۆ کاك عبدولخالق و باقی برادەران.

ئیتر خۆشیت

تکایە وەلام

برات: حەمەی فەرەج

م.ع مەڵبەندی یەك — ١٩٨٣/٤/٢٦

بۆ/ برای بەرێزو خۆشەویستم كاك عبدولخالق
سلاوێكی گەرمی برایانە
بە هیوای خۆشیتانم. زۆر سلاوم هەیە بۆ هەموو برادەران. برادەرانی ئێرە سلاوتان لێ ئەكەن و زۆر ئەحوالی منالەكان ئەپرسم.
برای بەرێزم گلەییی زۆرم هەیە لێت. هەڤالێكی زۆر بێ رەحم بویت. من ماوەی حەوت مانگە وام لە ناوچەی شارباژێر. بە نامەیەك بەسەرت نەكردین. ئێمە برای چەندەها رۆژی تەنگانەو هاوخەبات بووین. منیش بۆیە ئێستا بەم نامەیە بەسەرت دەكەمەوە، چونكە من بێ وەفا نیم‌و لە هەموو كاتێكدا بە دەنگ برایانی هاوخەبات‌و دێم بەسەریان دەكەم. پێشم خۆشە، كە هەر بەیەكەوە ئیش بكەین‌و ئاگامان لە یەكتریش بێت، چونكە ئێمە زۆر هیلاك بووین لە پێناوی كوردو كوردایەتی‌و تووشی سەدان مەشاكل‌و وەزعی نالەبار بووین. جا بۆیە پێم خۆشە بگەرێیتەوە ناو ریزەكانی یەكێتیی نیشتمانی بۆ ئەوەی بۆ خۆمان پێكەوە بین‌و بتوانین مەشاكلەكانی ناوچەكەمان چارەسەر بكەین‌و ئەگەر هەولیش بدەیت لەگەلّ كاك حەمەی حاجی مەحمود. چونكە ئەویش كورێكی باش‌و لێوەشاوەیە خزمەتێكی زۆری هەیە بۆ ئەوەی لەكیسمان نەچێت‌و هەمووومان پێكەوە ئیش بكەین بۆ بەرژەوەندیی میللەتی كوردو شۆرشەكەمان. ئیتر من بە واجبی خۆمم زانی بەم نامەیە ئاگادارت بكەم‌و هەموو جارێكیش باسم كردوون، كە نەبوایە ریزەكانی یەكێتیتان بەجێ نەهێشتایەو ئێستاش من مەسئولی عسكری مەلبەندی یەكم، ئەتوانم هەموو پشتگیرییەكتان بكەم‌و ئەو موشكلانەی، كە هەیە ئەتوانین بە وتووێژ چارەسەری بكەین بە شێوەیەكی برایانە.
ئیتر خۆشیت

براتت
حەمە فەرەج
١٩٨٣/٤/٢٦

برای بەڕێز کاك محەمەد فەرەج

لە پاش سڵاوی برایانە

نامەی بەڕێزتان گەیشت. دەربارەی هەندێك رووداو دوابوویت. بۆیە بە پێویستم زانی روونی بکەمەوە.

نوسیوتانە، کە پ.م ی ئێمە کەمینیان بۆ پ.م ی ئێوە داناوە لە دێوانە. ئەمەش کەم تا زۆر پێچ و بنەوانەی نییە وەکو هەمووان لە دێوانە دیویانە. کاکە گیان، مفرمزەیەکی ئێوە هاتبوون بۆ دێی دێوانە، کە ئەمەش ناگونجێن لەگەڵ رێکەوتنی دێوانە، لەکاتێکدا مەفرمزەی ئێمەش لەوێ بوون بێ تەقەو هەراو پ.م مکانی ئێوە گەڕانەوە بۆ مەسۆیی. جا ئەمە لەکوێ و کەمین لەکوێ. ئێمە هیچمان نەبیستووە لەسەر پشکنینی ماڵی زۆراب (مەبەست زۆرابی خۆمانە) لەناو سۆڵەو باوەڕ ناکەین پ.م مکان شتی وایان کردبێت. لەگەڵ ئەوەش، ئێمە تحقیق ئەکەین دەربارەی گرتنی دەروێش. ئیمڕۆ مەعلوماتمان وەرگرت، کە پ.م مکانی نزیك سۆڵە ئەم پ.م ەیان گرتووە. بەر لەوەش، کە هیچ بگاتە ئێمە، بەتالیۆنی قەرەداغمان گورج بەریان داوەو بۆ مەسەلەی چەکەکەی پێیان ووتوە، کە چەکی هەردوولا لای یەکتر هەیە تا ئێستا. دەربارەی شاخ گرتن، ئێمە مەعلوماتمان هەیە، کە میری نییەتی زەربەی هەیە بەرامبەر پ.م ەکانمان، جاشی خستۆتە ئینزار. جا بۆیە ناچار هەندێك پ.م لەسەر شاخ بمێننەوە. گەر پەیوەندی بە وەزعی میریەوە هەیە، بۆ بڵاونەکردنەوەی هێرشی ئێمە تەنها پ.م ی شارباژێرمان لێرەیە، ئەویش لەو جەوەدا ناچارین لێرەبن، چونکە هێرشی ی.ن.ك بۆسەر پشت ئاشان و هێرشی ئێزگەکەشیان وەزعێکی وەهای دروست کردووە، کە ئاسان نییە پ.م مکانی هەردوولا یەکتر ببینن و هیچ روونەدات. ئێوەش باسی ئەوەتان نەکردووە ئایا هێزتان بڵاوکردۆتەوە، کە کاك ئاوات وەهاب لە تیپی قەرەداغن؟

لەگەڵ رێزماندا.

باوکی سەلام

بەهادین نوری

١٩٨٣/٥/١٦

**برای بەڕێز کاك حەمەی حاجی مەحمود**

سلاّوت لیّ ئەکەم‌و هەواڵت ئە پرسم. هیوادارم هەمیشە باش بی.

برام، نامەیەکی‌ترم بۆ ناردویت بە کاك ئیبراهیم داو دواییش مەلا محەمەدی شارەزووری‌مان نارد بۆلات. بەلاّم بەداخەوە چاوی پیّت نەکەوتبوو. بە ڕاستی زۆر نیگەران بووم، کە تۆ تووشی ئەو وەزعە هاتبووی. هەموو برادەرانیش ئەوە ئەزانین، کە سەرئەنجامی هەندیّ دڵ ئیّەشان تووشی ئەوە بوویت‌و هەمووشی ئەزانین، کە تۆ کوڕیّکی چاك‌و لیّوەشاوەیت‌و ئەتوانیت بە چاکی بە دەوری خۆت هەڵسیت. دیارە هەتا لە یەکیّتی نیشتمانیدا بوویت حورمەت‌و پایەی پیّشمەرگانەت زۆر زیاتر بوو لەناو خەڵکدا. ئیّستاش ئەو کارە نەچووە بچیّت‌و هەر کاکە حەمەی جاران ئەبی. ئەگەر بگەڕیّتەوە ناو دۆست‌و برادەرانی خۆت، کە هاوشانی خۆت بن. من قسەم لەگەڵ هەموو برادەران کردووەو لە لایەن سەرکردایەتیەوە تخویل کراوم، کە وەعدی شەرەفت بدەمیّ بە هاتنەوەت. زیاتر لە جاران حورمەتت بگیری‌و پشتیوانیت لیّ بکریّت. هەر لە سنووری شارەزوور بمیّنیتەوە. خۆشت ئاگاداری وەزعەکەیت، کە ئەو جەماعەت‌و گروپانە بەرەو کزی‌و نابووت بوون ئەچن‌و هەر یەکیّتی‌یە روو لە گەشەکردنە. بۆیە بەڕاستی حەیفە کوڕیّکی وەکو تۆ لەناو ئەوانەدا بمیّنیتەوە.

برام: جەنابت هەندیّ گلەییت کردبوو لە چەند برادەریّکی ئیّمە، بەلاّم لەو رووەوە دڵنیابە، بە هاتنەوەت هیچ کەسیّك موعارز نابیّ‌و حەز ئەکەم بە روونی ئەوە بزانیت. من هەموو وەعدیّکت ئەدەمیّ لەو رووەوە. هەر کاکە حەمەی جاران

ئەبیٚو برادەران هەموو پێیان خۆشە بەهاتنەوەت بۆ ناو یەکێتی. بە هاتنەوەشت هەرچی نیگەرانیو دڵ ئێشانیکی کۆن هەبیٚ، هەمووی بە با ئەدرێتو سەرلەنویٚ علاقەی برایانەو پێشمەرگانە دروست ئەبێتەوە. خۆشت هەروەکو ئێستا چەكو پێشمەرگەی خۆت لا ئەمێنێتەوەو بگرە زیاتر یارمەتیت ئەدەینو هەوڵی تقویەکردنیشت ئەدەین، هەر لە ناوچەی شارەزووریش دەبیٚ. جا ئەگەر ئەمانەشت پیٚ باش نییە، ئەوا من وەکو برایەك داوات لیٚ ئەکەم خۆت لەو جەماعەتو لایەنانەیتر دورە پەرێز بگرە. پێمان خۆشە بە زویی ئاگادارمان بکەیتەوە لە هەڵوێستی خۆت.

لەگەڵ ڕێزدا

برات

حەمەی فەرەج

١٩٨٣/٥/٢٦

# گفتوگۆ لەگەڵ حكومەتدا

بەلای منەوە چارەسەركردنی زۆر لە كێشەكان بە دانوستانو گفتوگۆ چاكترەو لەبارترە. هەرچەندە دانان بە مافی میلەتێكی وەك كورددا لەلایەن حكومەتە یەك لەدوای یەكەكانی عیراقەوە تەنها چاوورا بۆ مەبەستی تایبەتی بوو، هیچ یەكێ لە حكومەتەكانی عیراق بەرپست نەهاتوونەتە پێشەوەو نەیان ویستووە بە وردی چارەسەرێكی بنەبڕی بۆ دابین بكەن. سەركردایەتیی كوردیش هیچ كات جوداخواز نەبوون، بەڵكو تەنها ویستوویانە كورد وەك نەتەوەیەكی خاوەن مێژووو كەلەپوورو كلتوری تایبەتی سەیر بكرێو ژیانی نەتەوایەتیی مسۆگەر بكرێو بە دانیشتوانی پلە دوو، سێ، سەیرنەكرێ. من بۆ خۆم بۆ پاشەڕۆژی عیراقو دەستێوەرنەدانی دەرو دراوسێو بێگانە لە كاروبارەكانیو بۆ نەهێشتنی هیچ دەلاقەیەك لە نێوان گەلانی عیراقداو بۆ پتەوكردنی حكومەتیش، هەمیشە لەو باوەڕەدابووم، كە دابینكردنی مافە رەواكانی كورد لە عیراقدا هیچ زیانێ بە رژێم ناگەیەنێ، بەڵكو دەبێتە هۆی پتەوكردنو بەهێزكردنیشیو كورد وەك نەتەوەیەك دەبێتە هاوكارو هاوسەنگەری گەل عیراقیش ئەوەندە خوێنی رۆڵەكانی نەدەڕژاو ئەو هەموو چەرمەسەریو كوێرەوەریەشی بەسەردا نەدەهات. بەلام حكومەتە یەك بەدوای یەكەكانی عیراق هەمیشە

ویستوویانە بە گیانی شۆڤێنیستیو تەسك بینیو دەمارگیرییەوەو بە زەبری ئاگرو ئاسن کێشەی کورد نەهێڵن. بێگومان ئەمەش بیرکردنەوەیەکی ئیفلیجەو ئەمڕۆش نەبێ، سبەینێ هەر دەبێ بە تەواوی دان بە مافی رەوای نەتەوەی کورددا بنرێ.

لە عیراقدا، راستە ئێستگەی رادیۆو تەلەفزیۆنی کوردیو رۆژنامەو گۆڤاری کوردی بەردەوام بووە، بەڵام هەمیشە بەشێکی زۆری راگەیاندن بۆ خزمەتو راژەی حکومەت خۆی بووەو ویستوویەتی بەزمانی کوردیش پڕوپاگەندە بۆ خۆیو بەناو دەستکەوتەکانی بکا. هەمیشەو بە درێژاییی ئەم ساڵانەی دوایی حکومەت پلانێکی ستراتیژیی درێژ خایەنی دانا بۆ تواندنەوەی نەتەوەی کوردو گۆڕینی جوگرافیاو شوێنەواری باو باپیریو نەهێشتنی روخسارو رواڵەتی نەتەوایەتی کورد لە زۆربەی شوێنەکانداو راگواستنو دورخستنەوەی لێیانو داگیرکردنو هێنانی بەکۆمەڵی خەڵکی باشووری عیراقو دانانیان لەو ناوچانەدا. ئەم کارانە تەنانەت کاری دەکردە سەر هەستی ئەو کوردانەش، کە سەر بە میری بوونو لە پەرەی دڵی دەدان. جگە لەوەی، کە نەتەوەخوازانو کوردپەروەران هەمیشە ئازاریان بەدەستەوە چەشتووەو دڵیانی داخ کردووەو لەبریی سەرکوتکردنو نەهێشتنی کێشەکە، هەمیشە هاوکێشەکە بە پێچەوانەوە دەکەوتەوە. واتە تینو تاوو تەوژمی کوردایەتی زیاتر پەرەی دەسەندو زۆرتر خەڵکی کوردستانی هان دەدا

بۆ تۆڵه سەندنەوەو فیداكاری لەرێی خاكو خۆڵو نیشتمانی خۆیدا، چونكه بیری نەتەوایەتی تێكەڵی خوێنو بەدەمارو لوولەكانی خوێندا هەمیشه له هاتوچۆدایه.

ئێمه له كاتێكدا له كۆتایی ۱۹۸۳دا شۆڕشەكەمان پەرەی سەند بوو، حكومەت به تەواوی حسابی بۆ دەكرد. ناوچەیەكی ئازادكراوی زۆرمان بەدەستەوە بوو. هەرچەندە بەهۆی شەڕی ناوخۆی حزبەكانی دیكەی كوردستان هێزی پێشمەرگه پێویستیان به حەسانەوەو رێكخستنی سەرلەنوێ بوو، بەڵام هەمیشه وورەی پۆڵایینی ئەو قارەمانانه هەر له پتەویو بەرزیدا بوو. لەو كاتانەدا شەهید (دكتۆر قاسملۆ) لەگەڵ (مام جەلال)دا چاوپێكەوتنیان لەبارەی وەستانی شەڕو گفتوگۆ لەگەڵ حكومەتی عیراقدا كرد بۆ چارەسەركردنی كێشەی كورد.

له راستیدا هەمیشه گفتوگۆ بەشێكه له خەبات، ئێمەش خەباتمان لەپێناوی به ئاشتی ژیاندا بوو. بۆیه پاش هەوڵێكی زۆری شەهید (قاسملۆ)، سەركردایەتیی یەكێتیی رازی بوو بەوەی به گفتوگۆو هەوڵیدا نوێنەری خۆی رەوانەی حزبه كوردستانیەكان بكا تا ئەوانیش رازی بنو هەموویان بەیەك دەنگ ببنه هێزێكی پتەوو داخوازیەكانمان بكەینه یەك بۆ ئەوەی لەكاتی گفتوگۆدا بەهێزبینو جگه لەوەش پرسوڕا به رۆشنبیرو پیاوی ناوداری میللەتەكەمان بكەینو رای ئەوانیش وەرگرین دەربارەی.

داخەکەم وەڵامی هەموو حزبەکانی دیکە نارەزایی بوو، بەڵکو چەندین بەیانی دژ بەیەکێتیشیان بڵاودەکردەوەو ناوو ناتۆرەی زۆریشیان خستە پاڵی. بەڵام ئێمە بەرژەوەندی گەلەکەمان لا پیرۆزتر بوو.

ئەگەر بەتەنها بتوانین هەموو خاڵەکانی بەیاننامەی ١١ی ئازاری (١٩٧٠) بە حکومەتی عیراق جێبەجێ بکەین، ئەوا دیسان هەر سەرکەوتنێکی مەزنە بۆ ئێمە. جگە لەوەش حکومەت خۆی بۆ جێبەجێکردنی ئەو خاڵانە ئەو سەردەمە رازی بوو. بۆیە سەرکردایەتی بریاری گفتوگۆیداو هەرگیز لەیادم ناچێ، بۆ مێژوو دەیڵێم، کە هەڤاڵ (مام جەلال) بریاریدا خۆی بچێتە بەغدا بۆ گفتوگۆ لەگەڵ (سەدام حسین)دا. هەرچەندە ئێمە پێمان چاك نەبوو، کە ئەو بچێ، چونکە هیچ (گەرەنتیەك) نەبوو بۆ ژیانی. ئەوسا پێمان گوت: "تۆ لەسەر چ بناغەیەك دەچیتە ئەوێ، ناترسی بگیرێیتو لەناوت بەرن؟"

بە ئازایانە گوتی: "من بۆ چارەسەری کێشەی کورد ئامادەم بچمە ترسناکترین شوێنو لەگەڵ دژترین کەس وتووێژ بکەم. (زەمانەتیش) تەنها ئەوەیە، کە من بە راستگۆییو خاوەن هەق دەچمە ئەوێو داوای مافێکی رەوا دەکەم. خۆ ئەگەر شەهیدیش بم، ئەوە بۆ من جێی شانازییە. نوێنەرانی یەکێتیی بە سەرکردایەتیی (مام جەلال) چوونە بەغدا، لەگەڵ سەدام حسەین کۆبوونەوە. هەردوولا لەسەر ئەوە پێکهاتن، کە کۆتایی بە شەری نێوانیان بهێنن. پاش ئەوە لەلایەن

عیراقەوە (تارق عەزیز) دانرا بە سەرپەرشتیاری وتووێژەكان. چەند جارێ نوێنەرانی بەغدا هاتنە بارەگای یەكێتی لەدێی (سوێرە).

ئەوەندەی لە كۆبوونەوەكانی بەغداو لە كۆبوونەوەكانی كوردستانیش ئاگادار بووم، كە لە زۆربەیاندا بەشدار بووم، تیایدا زۆر بە ئاشكرا دیار بوو، كە حكومەت نەیدەویست بەڕاستی بێتە پێشەوە. (سەدام حسێن) هەر دكتاتۆرەكەی جاران بوو، هیچ گۆڕانكاریەك لە سیاسەتیدا نەبوو تەنها دەیویست لەو ناوچانە تەرازوی هێزەكانی ڕێكبخاتەوەو بەهۆی كوردەوە ئێران هێزی خۆی نەهێنێتە ناو خاكی كوردستانەوەو ببێتە مەترسی بۆ ئەم. لەوە زیاتر پەیمانەكانی تەنها گوشتن بوو، چونكە لە دواهەمین كاتەكانی گفتوگۆدا بڕیاردرا، كە بەیانێكی ڕەسمی لە ئێستگەو تەلەفزیۆندا بڵاو بكرێتەوە، كە ئەمە بۆ ئێمە سەركەوتنێكی گەورە دەبوو. بەڵام بەعسیەكان چەندین جار بە بەهانەی جیاجیاو پڕوپوچ دوایان دەخستو دەیان گوت وەختی خۆی نییەو لەكاتی خۆیدا ئەو بەیانەمان خوێندۆتەوەو پێویست ناكا دووبارەی بكەینەوە، بەتایبەتی توركیا ناڕازی بوو، نەیدەویست كورد ببێتە خاوەن مافی خۆی، بەڵكو داوای ویلایەتی (موسڵ)یشی دەكرد، كە گوایە لە توركیا دابڕاوەو خراوەتە سەر عیراق. ئەم ووتووێژانە ماوەی ساڵێ زیاتری خایاند، بەڵام بێ سەرئەنجام بوو.

لە یەکێ لە کۆبوونەوەکانی سەرکردایەتیدا، کە باسی زۆر شت کرا، ناڕەزاییی خۆم نیشانداو دەربارەی ئەم گفتوگۆیە بە دژ وەستامەوەو پێم گوتن " ئەو رژێمە هەرگیز ئامادە نییە دان بە مافەکانی کورددا بنێ. لەبەر ئەوە چاکتر وایە زووتر بکشێینەوە."

کارەکە گەیشتە ئەوەی، کە کێشەو تێکچوون لە نێوان منو (مام جەلال)دا دروستبێ، لەسەر ئەوەی پێشنیازەکانی ئێمەی پشتگوێ دەخستو کاری پێیان نەبوو، تا وای لێهات لە مانگی تشرینی یەکەمی هەمان ساڵدا لەگەڵ (مام جەلال) تێکچووم‌و کۆبوونەوەم جێهێشت‌و هەر لەوێ نامەیەکی دەست کێشانەوە (ئیستقالە)م نووسی. کاك (دکتۆر فوئاد مەعسوم)، کە کارگێڕی مەکتەبی سیاسی بوو، خێرا گەیشتە سەرم‌و داوای لێکردم ئیستقالەکەم بکێشمەوە. هەروەها هەموو برادەرانی سەرکردایەتیش هەر ئەو داوایەیان لێکردم. پاشان منیش رازی بووم بەوەی ئیستقالە نەکەم، بەڵام دەبێ بواری پشوودانم بدەنێ بۆ خۆم بۆ ماوەیەك لە دێیەکی کوردستان دابنیشم، ئەوانیش داواکەیان قبوڵ کردم‌و منیش چووم لە دێی (هۆمەرئەمان) لە ناوچەی قەرەداخ نیشتەجێ بووم.

سەرکردایەتی بروسکەی بۆ کردم، کە دەبێ بگەڕێمەوە ناوچەی (سیروان) لە مەرگەو کانی توو، کە نەم دەزانی قەدەر لەوێ چاوەڕوانمەو بۆ ئەوەی فریای ئەو قەدەرە بکەوم، دەبێ بکەومە رێ.

# برینەوەی قاچم

## گۆڕەوی[3]

لەدەرەوە
سەرمای (کانوون)
دەمی (با)ی لە گۆ خستووە
لەژوورەوە
خۆی بە تەنیا دانیشتووە
لاڵ و پاڵ وەك بەرخ و کاوڕ
منداڵ نوستوون.
مێردیش ئەوە چەند ساڵێکە
زریانێکەو

[3] ئەم شیعرە ساڵی (١٩٨٥)دا لە شاخ لە ناوچەی شارباژێڕ شاعیری بەناوبانگی گەلەکەمان کاك (شێرکۆ بێکەس) نوسیویەتی لەسەر من، بریتییە لەوەی، کە پێش ئەوەی قاچی راستم ببڕێتەوە، داوام کردبوو جوتێ پوزەوانەم بۆ بچنن، بەلام بەداخەوە، پێش ئەوەی پوزەوانەکەم تەواو ببێ، قاچی راستم لەدەست دا. ناوەرۆکی ئەم شیعرە بریتییە لەم چەند دێڕەی سەرەوە.

شوێن عەشقی چیا کەوتووە
خۆی بەتەنیا دانیشتووە
ئەڵێی شۆڕەبی پاییزە
سەری بۆ کۆش داخستووە
هەر ئەچنێت و ئەچنێ
نیوە شەوێ تەواو ئەبێ!
ئاخ نازانێ! داخ نازانێ
کاتێ گۆرەوی ئەگاتێ
ئەو بەتەنها هەر تاکێکی
بۆ قاچەکەی چەپی ئەوێ!

ساڵی ١٩٨٤ من ئەندامی سەرکردایەتیو لێپرسراوی مەڵبەندی سێی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان بووم‌و مەڵبەندەکەیشم لە (بۆتێ) بوو. ماوەیەك لە کاتی وتووێژدا لە ناوچەی (قەرەداخ) لە دێی (هۆمەرئامان) مامەوە. لەوێ بنکەیەکم هەبوو، وەکو سەرپەرشتکاری سەربازی ناوچەکە.

ئەوکاتە وتووێژ لە نێوان ئێمەو حکومەتی (بەغدا)دا هەبوو، بەڵام حکومەتی عیراق هیچی بۆ نەکردین، ئەو هەر بیری لەوە دەکردەوە

چۆن لەنێوماندبەرێو سوود لەو ناکۆکیو ناتەواوییەی نێوان خۆمان وەرگرێ.

لە لایەن بەرێز (مام جەلال)و مەکتەبی سیاسییەوە بە بروسکەیەك ئاگاداریان کردم، کە بگەڕێمەوە بۆ سەرکردایەتیو مەکتەبی سیاسی، کە ئەوکاتە بارەگای سەرکردایەتیو مەکتەبی سیاسی لە (کانی توو) بوو. منیش دوای چەند رۆژێ گەڕامەوە بۆ ئەوێ.

شەوی ۱۹۸۵/۵/۲۳ گەیشتمە لای بەرێز (جەمال ئاغا) لە مەرگە. ئەوکاتە بارەگاکەی لە دێی (ئاوەژێ) بوو. دووشەو لەوێ بووم. بەرێز (مام جەلال)و کاك (نەوشیروان مستەفا) هاتن بۆلام باسی رەوشەکەیان بۆکردم، کە حکومەتی عیراق هەتا ئێستا نەیدەویست هیچ بۆ کورد بکا. ئەوەی گوتوویەتی لە هەمووی پەشیمان بۆتەوە.

پاشان گوتیان: "ئێمە بەنیازین سەرلەنوێ هێزو تیپو شانە نهێنیەکان رێکبخەینەوەو تۆش دەبێ ئامادە بی."

گوتیان: "ئێمە دەڕۆین بۆ دروستکردنەوەو رێکخستنەوەی ناوچەی سنووری مەڵبەندی سێ. هەروەها کاك (نەوشیروان)و کاك (کۆسرەت)یش بۆ سنووری مەڵبەندی چوار.

رۆژی ۱۹۸۵/۵/۲۵، لای نیوەڕۆ، ئێمە لای (جەمال ئاغا) میوان بووین. پێشمەرگەکان هەواڵیان بۆ هێناین، گوتیان ۳ فڕۆکە بە دۆڵەکەدا هاتنو دەچن بەرەو (کانی توو)و (سیروان). ئێمەش ئاگاداری هەموو

پێشمەرگەکانمان کرد، کە باش وریابن‌و جێگەکانی خۆیان چوڵ بکەن‌و بچنە شوێنە بەرزەکان. ئێمە خۆشمان چووینە دەرەوە.

فڕۆکەکان گەیشتنە (کانی توو)و (سیروان)و بۆ ماوەی نیو کاتژمێر هەموو ناوچەکەیان بە دێکان‌و بارەگاکانمانەوە بۆردومان کرد، دوای ئەوە گەڕانەوە.

بەڕێز (مام جەلال) ئۆتۆمبیلەکەی خۆی بۆ ئێمە نارد بە کوڕێکی شوفێردا، ناوی (سیروان) بوو، کە بچینە خوارەوەو لە زیانی گشتی بزانین. لە هەمان کاتدا ئەو دوو هێزەی لەوێ بوون، هێزی (عەبدوڵڵای مام عەلی)و هێزی کاك (عەبدولڕەحمان)، دەبوو ئاگاداریان بکەین، کە ووریابن نەبا سەرلەنوێ میری هێرش بهێنێتەوە.

ئێمەیش رۆیشتینە خوارەوە بۆ بەری (بنگرد)و (مەرگە) نەوەك سوپا هێرش ببا، دەترساین ئەمە پیلانێکی داڕێژراو بێ. هەر لەو کاتەشدا دەمانبینی دەیان کەس بە تراکتۆرو پیکاب‌و ئۆتۆمبیل دەیان بردنە خوارەوە بۆ نەخۆشخانەکەی (مەرگە). هەڵبەت ئەو کاتە نەخۆشخانەی سەرەکیی ئێمە لە (مەرگە) بوو، هەموو داو دەرمان‌و پێویستییەکانی برین پێچی لەوێ بوو. ئێمەش لەگەڵ (جەمال ئاغا)و چەند برادەرێکی‌تردا رۆیشتینە خوارەوە بۆ ئەوێ. کە چووینە نەخۆشخانەکە، بینیمان دەیان کەس لەو هۆڵەدا کەوتوون. یەکێ دەستی، یەکێ قاچی، یەکێ پشتی بە بۆردومانی فڕۆکە بریندارکراوە.

ئێمه لەنێو نەخۆشخانەکەدا بووین، تۆپێ تەقیو بوو بەدوانو سیان. منیش چوومه دەرەوەی نەخۆشخانەکەو داوام له هەموو پێشمەرگەکان کرد بچن بۆ یاڵه بەرزەکان.

پێم گوتن: "ئەمه بە تەئکید هێرشو کێومالی سەربازییە، ئەگەر وابێ، ئەو بریندارانە هەموویان دەگیرێنو کەسیشمان دەرناچین لێی."

ئەوکاتە دوو تیپیش لەپێشەوە بوون لەپشتی بنگردەوە، تیپی (کاکە عەبدوڕەحمان مەرگەیی)و تیپی (عەبدوڵلای مام عەلی).

پێشمەرگەکانمان کۆکردەوەو بڕۆین، بەڵام تۆپەکان له چەند لایەکەوە دەهاتن، له (بنگرد)و له (رانیه)و له (قەڵادزە)و له (قەرەسرت)ەوە. نەخۆشخانەکە، کە کاتی خۆی سەربازگەی حکومەت بوو، له هەموو لایەکەوە تۆپیان بۆ هەڵدەدا. چەند کەسێکیتر لەوێدا بریندار بوون.

ئێمه تەنها دە دەقیقەیەك له بارەگای (فەوجی بنگرد)ەوە دووربووین. تۆپ باران له (بنگرد)و (رانیه)و (چوارقوڕنە)وە بەرەو نەخۆشخانەکە بەردەوام بوو. من چوومه نەخۆشخانەکە بۆ سەردانی بریندارەکان. کە هاتمه دەرێ، لەسەر جادەی بەردەمی نەخۆشخانەکە تۆپێ له پێشمدا تەقییەوەو بووە هۆی لەدەستدانی قاچی راستم. دوو پێشمەرگەش لەوانەی لەگەڵمدا بوون بریندار بوون. (جەمال ئاغا)شم لەگەڵدا بوو، بەڵام ئەو سەلامەت دەرچوو. بە ئۆتۆمبیلێ منیان بردە بارەگای سەرکردایەتی له (کانی توو)، تۆپ بارانیش هەر بەردەوام بوو.

ئەو کاتە بەڕێز (مام جەلال) لە (سیروان) بوو. من باری تەندروستیم زۆر زۆر خراپ بوو. بە ئاگاداریی زۆربەی زۆری برادەران وەك دکتۆر فوئاد مەعصوم بێ بەنج و کەرەستەی پزیشکی لەنێو تاریکی و بەچرایەك و چەقۆیەك، لەگەڵ ئازارو ژاندا، دکتۆر شالاوو دکتۆر خدر کەوتنە نشتەرگەری و لە جومگەی ئەژنۆمەوە قاچیان بڕیمەوە. هەر بۆ ئەو شەوەو بۆ بەیانیەکەی، کە چاوەڕێی فڕۆکەمان دەکرد بێتە سەرمان. بردیانم بۆ ئەشکەوتێ لەبن شاخەکەی (کانی توو). ئەو ڕۆژەو ڕۆژەکانی‌تر چەندجار فڕۆکە دەهاتە سەرمان بۆ بۆردوومانکردنمان.

لەوێ لە ژوورێ دایاننام. بە تابوتێ گواستیانمەوە بۆ ئەشکەوتەکەی پشت (کانی توو)، سێ هەفتەیەك لەوێ مامەوە، بەلام وەزعم یەکجار خراپ بوو. لەو کاتەدا کاك نەوشیروان مستەفاو دکتۆر فوئاد مەعصوم و مولازم عومەر چەند جارێ سەردانی کردم. هەروەها بەڕێز (مام جەلال)یش چەند جارێ هاتە سەردانم.

(مام جەلال) پەیوەندیی بە (دکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملۆ)وە کرد، کە چارەسەرێکم بکەن. ئەوان هەر مانگێ دوو دکتۆریان لە (فەرەنسا)وە بۆ دەهات بۆ یارمەتیدانیان.

بارەگای دەفتەری سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە (گەڕەدێ) بوو. لەسور داوای دکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملۆ لەدیوی

(شارباژێر) منیان برده نزیك ئهوانو له (گهڕهدێ) کهپرێکیان بۆ کردم. دکتۆره فهرهنسیهکان تهماشایان کردمو گوتیان لایهکی ئهژنۆی ماوه پێویستی به نهشتهرکاریهکی بهپهله ههیه، چونکه گهر نهکرێ ئهوا تووشی گهنگرین دهبێ. برادهرانمان داوایان لێکردن نهشتهرکاریهکهم بۆ بکهن، بهڵام دکتۆرهکان له ماوهی دوو رۆژدا دهبوو بچوونایهتهوه (بهغدا)و لهوێوه بۆ (فهرهنسا)، لهبهر ئهوه پێیان نهکرا. برادهرانی دیموکرات یارمهتییهکی زۆریان دام، پێشنیازیان کرد، که وهك پێشمهرگهیهکی خۆیان بمژمێرن به مهرجێ کهس نهزانێو لهگهڵ خێزانهکهمدا بمبهن بۆ نهخۆشخانهی (کارێزه)، لهوێ بارهگای لقی حکومهتی عیراقی لێبوو، ههموو شتێکیان ههبوو. گوتیان به نهێنی دهمبهنه ئهوێو سهرلهنوێ لاقم دهبڕنهوهو ئهوجا دهمهێننهوه. بردمیانه ئهوێو نهشتهرکارییهکی دیکهیان بۆ کردم. شهوێ لهوێدا مامهوه. بۆ رۆژی دواتر هێنامیانهوه بۆ (گهڕهدێ). ماوهیهکی زۆر لهژێر چاودێریی دکتۆرهکانی ئهواندا بووم، له تهنیشت نهخۆشخانهکهی ئهوانهوه کهپرێکیان بۆ خۆمو خێزانهکهم کردو لهو ماوهیهدا چهند جارێ فرۆکهی ئێرانی بۆمبابارانی دهوروبهرهکهی کردو زیانێکی زۆری گهیاند، بهڵام سهلامهت بووین.

تا دههات دنیا بهرهو سهرماو سۆڵه دهچوو، شهویش ساردتر دهبوو. (مام جهلال) هاته لامو ههوڵێکی زۆریدا، که رهوانهی جێگهیهکم بکا بۆ

عیلاج کردنی تەواوەتی. لەو کاتەدا خوالێخۆشبوو کاك (حەمە رەحیم) واتە (خاڵە حاجی)، کە ماڵی لە ئێران بوو، خەسوی ناردەلام، کە ئەگەر بمەوێ، ئەوا دەتوانێ مۆڵەتم بۆ وەربگیرێ بچمە ئێرانو لەوێوە وەکو پێشمەرگەیەکی ئەوان رەوانەی وڵاتێ بکرێم. خەسووی (خاڵە حاجی) چەند رۆژێ لامدا مایەوە. جارێکی دیکەش (مام جەلال) هاتەوە بۆ سەردانمو لە پێشنیازەکەی (خاڵە حاجی) ئاگادارم کرد. ئەویش پێی چاك بوو، کە وەڵامی بۆ بنێرمو سڵاوی (مام جەلال)یشی پێ بگەیەنم تا بەزووترین کات هەوڵ بدا چارەسەرێکم بکا. منیش لەوبارەوە (خاڵە حاجی)م لە رێی خەسوویەوە ئاگادرا کردەوە.

پاش دوو هەفتەیەك وەرەقەیەکی بۆ ناردم بە ئیمزای (موحسین رەزایی)، کە بۆم هەیە بۆ ماوەی مانگێ لە ئێراندا بمێنمەوە.

ماڵو منداڵەکەم ناردە (مالوومە)و خۆشم لەگەڵ (عەبدولرەحمان)و چوار پێشمەرگەی دیکەدا کەوتینە رێ بۆ (ورمێ). چەند رۆژێ لەو شارەدا مامەوە. لەو ماوەیەدا چەند لێپرسراوێکی ئەوێم چاو پێکەوت، وەك: بەر پرسی (ئیتلاعاتی ئوستانی ئازربایجانی غربی). هەندێ پرسیاری دەربارەی بارودۆخی کوردستان لێکردم. منیش وەك خۆم ویستم بەو جۆرە بۆم باسکرد، بەڵام ئەو بڕوای پێنەکردمو گوتی: "ئێمە زانیاری تەواومان دەربارەی ژمارەی هێزەکانی یەکێتیو چۆنیەتیی کارکردنیان هەیە." ئەوەشی پێ گوتم کە ئەوان وەك

موسوڵمانی ڕێی منیان داوه، كه له ئێراندا بمێنمەوه. منیش گەلێ سوپاسم كردن.

كاك (حەمه ڕەحیم) داوای لێبوردنی لێكردم، كه ئەو نەیتوانیوه ڕاستی له (ئیتلاعات) بشارێتەوەو ئەوان تەنها ویستویانه هەندێ زانیاری له من وەربگرن دەربارەی یەكێتی.

دوای دوو هەفته چوومه تاران. پاش ماوەیەك مانەوەم لەوێ، له ڕێی قاچاخچییەوه هەوڵی چوونه دەرەوەم دا. چوومه (نەمسا)و لەوێوه بۆ (ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات)و لەوێشەوه بۆ سوید. من له ڕۆژی ١٩٨٥/١١/٢٥دا گەیشتمه سوید.

# چوونم بۆ سوید

ئەو ڕۆژەی گەیشتمە (سوید)، بردمیانە کەمپێکی پەنابەران لە (هێلسنگ بۆری)، کە شارێکە دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای (سوید) نزیکی سنووری (دانیمارك). لەگەڵ خۆمدا ژمارەی تەلەفۆنی چەند برادەرێکم هێنا بوو، کە لە (سوید)دا دەژیان، تەلەفۆنم بۆ کردن‌و هاتنە لام‌و لە کەمپەکە مۆڵەتی چوونە دەرەوەیان بۆ وەرگرتم‌و بردیانم لەگەڵ خۆیاندا بۆ شاری (مالموێ)و لای خۆیان میوانداریان کردم. دواتر لە لایەن (سەرداری سەعید خەڵەف)و کاك (دانا مستەفای ئەندازیار)وە ئاگاداریان کردم، کە بچمە کەمپی (ئەلبیستە)و دوو هەفتەیەکیش لەوێ مامەوە. لەو ماوەیەدا لیژنەیەکی تایبەت سەردانی کردم ناویان خستمە لیستەی برینداربووەکانەوە، کە هەموویان لە شارێ خرپدەکرانەوە بە ناوی (لینشۆپینگ). ئەو شارە نەخۆشخانەیەکی تێدا بوو، کە هەر کەسێ بریندار ببوایە، بۆ چارەسەرکردن دەیانبردە ئەوێ.

# شه‌هیدبوونی عه‌بدوڕه‌حمان

ساڵی ١٩٨٦، بۆ ماوه‌ی چوار مانگ له نه‌خۆشخانه‌یه‌ك بووم له (سوید) له شاری (لینشۆپین). دوای ئه‌و چوار مانگه، له‌سه‌ر داوای چه‌ند براده‌رێکی خۆشه‌ویستم پێیان باش بوو پاش چاره‌سه‌ر بچمه شاری (ئۆپسالا)و له‌وێ له نزیکی ئه‌واندا بژیم. پاشان به مۆڵه‌تی حکومه‌تی (سوید) خانوویه‌کیان بۆ په‌یداکردم، ئه‌مه‌یش له مانگی ١٩٨٦/٥دا بوو. ماوه‌یه‌ك له‌وێ مامه‌وه‌و له هه‌موو شوێنێکی (سوید)و ولاَتانی تره‌وه دۆست‌و ناسراو ده‌هاتن بۆ لام. ئه‌و ماوه‌یه‌ش، که له نه‌خۆشخانه‌ی شاری (لینشۆپین) بووم، له‌ژێر پرۆسه‌ی چاره‌سه‌رکردندا زۆر له براده‌رانیتر ده‌هاتن بۆ لام. هه‌ڵبه‌ت ئه‌وان ده‌یانزانی (عه‌بدوڕه‌حمان)ی کوڕم شه‌هید بووه. به‌ڵام من نه‌مزانی بوو.

که هاتمه شاری (ئۆبسالا)، له دوای ماوه‌یه‌ك، به هۆی نامه‌ی براده‌رێکمه‌وه، که ناوی (حمه‌ی عه‌تێ) بوو له ئه‌ڵمانیا ده‌ژیا، ئه‌و هه‌واڵه دڵ هه‌ژێن‌و جه‌رگ بڕه‌ی پێڕاگه‌یاندم‌و له نامه‌که‌یدا سه‌رخۆشیی لێکرد بووم به‌بۆنه‌ی شه‌هید بوونی (عه‌بدوڕه‌حمان)ه‌وه. به‌ڕاستی له‌گه‌ڵ ئه‌و هه‌موو ره‌وشه ناته‌واوه‌ی خۆمدا ئه‌م هه‌واڵه کاریگه‌رییه‌کی ده‌روونی‌و رۆحی تێکردم. هه‌ڵبه‌ت من له‌و ماوه‌یه‌دا، که له نه‌خۆشخانه بووم، بیرم له‌وه ده‌کرده‌وه بۆچی (عه‌بدوڕه‌حمان) هیچ

دەنگ‌و نامەیەکی نییە؟ زۆر دلگران دەبووم بەوە، کە (عەبدوڕەحمان) بێدەنگە، چونکە من لە ١٩٨٥/١١/٢٥، کە گەیشتمە (سوید) هەر ڕۆژ ناڕۆژێ ئەو تەلەفۆنی لەگەڵدا دەکردم‌و دەربارەی بارو جێگەو ڕێگەم پرسیاری دەکرد، بەڵام دوای ئەوەی چوومە نەخۆشخانەو کەوتم، ئیتر ئاگام لە هەواڵی ئەو نەما. لە ڕێگەی برادەران‌و هەروەها حیزبی دیموکراتیشەوە، بەهۆی کاك (کەریمی هاشمی)یەوە هەواڵمدا هەواڵی بزانم. ئەویش پێی ڕاگەیاندم، کە بە جیهاز قسەمان لەگەڵ بەڕێز (مام جەلال) کردووەو گوتویەتی:

"بە (حەمە) بڵێن (عەبدوڕەحمان) لە جەنگ‌و ڕووبەڕووبوونەوەدایەو سەلامەتە."

ڕۆژانە ئەو برادەرانەش، کە دەهاتنە لام، هەر هەواڵیم دەپرسی‌و دەیان گوت:

"لە کوردستان شەڕ گەرمەو تاکو ئێستاش هیچ شتێکی وا نەبووە دەربارەی (عەبدوڕەحمان).

ئەوە بوو، بەهۆی نامەکەی کاك (حمەی عەتێ) زانیم، کە شەهید بووە. بەڕاستی، هەرچەندە خۆم وەزعم خراپ بوو، برینەکانیشم هێندەیتر کولانەوە. چەند ڕۆژێ لە شاری (ئوپسالا)دا پرسەمان دانا. پرسەیەکی زۆر قەرەباڵغ بوو. لەهەموو شوێنێکی (سوید)و (دانمارك)و (ئەڵمانیا)وە خەڵك هاتبوون بۆ بەشداریکردن لەو پرسەیەدا. لێرەدا

دەمەوێ زۆر زۆر سوپاسی ئەو برادەرو دۆستە بەوەفایانە بکەم بۆ بەشداربوونیان لەو پرسەیەدا، کە بە هاتن‌و نامەو بە تەلەفۆن لەگەڵماندا بوون. بەڕاستی ئەوەی ئەو برادەرانە کردیان بە جیاوازیی بیروباوەڕی جیاجیاوە. زۆر سەبووریی بە من داو وای لێکردم بتوانم زیاتر هێور ببمەوەو سەبووریم بۆ بێ بەرامبەر بەو کۆستە گەورەیە.

هەرچەند من چەندین کوڕی قارەمان‌و بەتوانام لەگەڵدا شەهید بووە بەدرێژایی ئەم شۆڕشە، کە ئەوانیش وەکو براو کوڕی من وابوون، بەڵام ئەوەی زیاتر کاری لە من کرد، ئەوە بوو، کە من کوردستانی (عیراق)م بەجێهێشت، هەرچوار خێزانەکەمان لای ئەو دانا، زۆر دڵم پێی‌خۆش بوو، چونکە لەڕاستیدا هەموو سیفەتێکی جوامێرانەو پیاوەتیی تێدا بوو بەرامبەر بەخێزانەکەمان‌و خەڵکە چاکەکەی کوردستان.

دوای دوو هەفتە، لەمانگی ٦/ ١٩٨٦، بە یارمەتیی برادەران، لە ڕێگەی (ئێران)ەوە گەڕامەوە بۆ کوردستان‌و برای بەڕێز کاك (عەبدولڕەزاق فەیلی)یش لەگەڵمدا هات تا (ئێران). هەروەها برای بەڕێزم کاك (جەمال ئاغا)و چەندین برادەریتر هاتن بەپیرمەوە بۆ (تاران). پاشان لەوێ دەرچووین بەرەو کوردستانی (عیراق)و دوای ٣ ڕۆژ گەشتینە گوندی بالَخ. ئەوکاتە ماڵمان لەوێ بوو.

پرسیمان: "تەرمەکەی (عەبدوڕەحمان) لەکوێ ناشتوویانە؟"

گوتیان: "لە گوندی (مالوومە)یە."

منیش بێ ئەوەی دابەزم لە ئۆتۆمبیلەکە، یەکسەر چووم بۆ سەر گلکۆو مەزاری.

بەڕاستی شەهیدبوونی ئەو جوامێرە خەسارێکی گەورە بوو لە بنەماڵەکەمان‌و خەڵکی کوردستان. ئەو قارەمانە هیچ خێرو خۆشییەکی بۆ خۆی نەدەویست، هەموو کاتەکانی تەرخانکرد بوو بۆ خزمەتکردن بە خەڵکی کوردستان. بەڵام ئەوەش جێگەی دڵخۆشیی من بوو، کە ئەو لە شەڕێکی قارەمانانەی دەستەو یەخەداو دوای ئەنجامدانی کارە پیرۆزەکەی، کە خۆی پێشتر دیاری کردبوو توانیبووی بە ئەنجامی بگەیەنێ. ئینجا شەهید کرا بوو.

ئەم نەبەردە هیچ کەسێکیش نەبووە گلەیی لێ هەبێ لەبوارەکانی خەبات‌و تێکۆشانیدا.

دوای ئەوەی لەسەر قەبران گەڕامەوە، چوومە دێی باڵخ بۆ لای مناڵەکان، کە زۆر وەزعیان خراپ بوو. دڵخۆشیم کردن‌و پێم گوتن: "من زۆر دەمێکە چاوەڕوانی ئەمەم دەکرد، کە کاک (عەبدولڕەحمان) شەهید ببێ، چونکە ئەو هیچ حسابێکی بۆ دوژمنانی گەلەکەمان نەدەکردو لە هیچ شەڕێکدا سڵی لە دوژمن نەدەکردەوە، بەوە سەبووریی خۆم‌و ماڵ‌و مناڵم دەدایەوە، کە کوڕی من لەپێناوی بەرژەوەندیی میللەتدا ڕۆیشتووەو هەموو خەڵکی کوردستانیش ئەو شاهیدیەمان بۆ دەدا، کە کاک (عەبدوڕەحمان) چ پیاوێکی لێهاتوو

دڵسۆزبووه. ئەو ماوەیەی، کە لە گوندی (باڵخ) بووین لەبەر هێرش‌و بۆردومانی فڕۆکەو تۆپی دوورهاوێژ دەچووینە دەری گوندەکەوە. لەڕاستیدا منیش زۆر وەزعم خراپ بوو، ئازاری قاچەکەم هەر بەردەوام بوو، قاڵبێکی کاتییان بۆ کرد بووم بۆ ئەوەی بیکەمە پێم‌و بتوانم هاتووچۆی پێبکەم. هەموو قاچم ببوو بە برین، لەگەڵ ئەو هەموو ئازارەی‌تردا، کە هەم بوو. دوای ماوەیەك برای بەڕێز کاك (جەمال ئاغا) لە بنارەکەی بەرامبەر بە گوندی (مالوومە) کەپرێکی کردبوو، داوای لێکردم بۆ ماوەیەك بچمە ئەوێ. چەند بۆرییەکی ئاوو ئاوەڕۆی لێبوو لە نێویدا دەنووستین.

ئەوکاتە (شێخ حسێن تیماری)یش بریندار ببوو. دوای ماوەیەك شەڕی (قەیوان‌و ماوەت) دەستی پێکرد. حکومەت بە شەو بە تۆپ بۆردومانی هەموو ناوچەکەی دەکردو بە رۆژیش بە فڕۆکە هێرشی دەکرد. منیش وەزعم زۆر خراپ بوو، بۆیە ناچاربووم هەوڵ بدەم هەندێ لە منداڵەکان بگەڕێنمەوە بۆ نێو شارو لە ماڵی خزمەکاندا خۆیان حەشار بدەن‌و هەندێکی تریشیان لەگەڵ خۆمدا بیان بەم بۆ (ئێران). هەروەها برای بەڕێز (مام جەلال)یش ئاگاداری کردم، بگەڕێمەوە بۆ دیوی (ئێران)، چونکە رۆژ بە رۆژ شەڕەکە گەرمتر دەبووو حکومەت نیازی وابوو ئەم ناوچانە هەمووی بگرێتەوە. منیش داوام لێکرد بەڵکو بەلگەیەکی هاتووچۆم بۆ بکەن تا بچمە نێو (ئێران)ەوە، لەگەڵ هەندێ

لە منداڵەکانمدا. ئەویش نامەیەکی پێدام بیدەم بە (ئاغای رەحیمی)، کە لێپرسراوی (قەرارگای رەمەزان) بوو.

دوای چەند رۆژێ چوومە لای ئاغای رەحیمیو نامەکەم دایێ.

پێیگوتم: "دەتانەوێ لەکوێ دابنیشین؟"

ئێمەش پێمان باش بوو بچینە شاری مەهاباد. ئەویش نامەیەکی بۆ نووسیم بۆ فەرمانداری (مەهاباد)و لەگەڵ منداڵەکاندا رێکەوتین بەرەو (مەهاباد)و لەوێش چووینە ماڵی برای بەرێز کاك (جەلال ئاغا)، کە پیاوێکی دڵسۆزو بەوەفا بوو بەرانبەر بە خەڵکە لێقەوماوەکەو دوو شەو لە ماڵی ئەوانماینەوە. پاشان داوام لێکردن بەڵکو هەوڵ بدەن لە نزیك خۆتان دوو ژوورمان بۆ پەیدابکەن. ئەوکاتە ماڵیان لە پارکی کودەك بوو، لە نزیك خۆیان، دوو ژووریان بۆ پەیداکردین لە خانووەکەی (جەلیل گادانی)، کە ئەوکاتە ئەندامی دەفتەری سیاسی (حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران) بوو. ماوەیەك لەوێ ماینەوە، بەڵام بەهۆی ئەوەی خەڵکێکی جۆراوجۆر هاتووچۆیان دەکردین بۆ سەردان لە ئۆردوگاکانی بەشی کوردستانی خۆمانەوە. چەند جارێ (ئیتلاعات) بانگی کردینو پرسیاریان دەکرد: "ئەم خەڵکە بۆچی هاتووچۆتان دەکەن؟" منیش دەمگوت: "هەموویان دۆستو ناسراونو بۆ سەردانمان دێن" هەرچەند ئەوان رازی نەبوون بەوە، بۆیە دواتر بیرمان لەوە کردەوە، کە خێزانەکەم بە نهێنی بنێرم بۆ (سلێمانی) بۆ

سەردانی هەندێ لە منداڵەکان، کە لە (سلێمانی) مابوونەوەو منیش بگەڕێمەوە بۆ (سوید).

بەڵام پێش ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ سوید، (ئیتلاعات)ی ئێران ناردیان بەشوێنماندا‌و بە توندی لەوە ئاگاداریان کردمەوە:

"نابێ کەس هاتووچۆتان بکا. ئەگەر هەر کەسێکیش دێ بۆلاتان، دەبێ ناوی بنووسن‌و بیدەن بە ئێمە."

منیش پێم گوتن:

"شتی وا چۆن دەبێ؟ ئێمە خۆمان نانێرین بەدوای کەسداو ئەوانەی دێن بۆلامان هەمووی دۆست‌و ناسیاوە."

بەڵام ئەوان زۆر نیگەران بوون بەمەو ئێمەیان بانگ کرد بۆ (ئیتلاعات)و خۆم‌و منداڵەکانمیان زیندانی کردو ماڵەکەشیان داخستین، گوتیان: "دەتاننێرین بۆ شاری (خوی)."

بەمەش زۆر دۆست‌و برادەرانی خەڵکی (مەهاباد) نیگەران بوون.

ئەو کاتە کاك (رەفعەتی مەلا) بەرپرسی پەیوەندییەکان بوو لە (تاران). زانیبووی‌و هەواڵیان گەیاندبوو بە (مام جەلال). دوای (٢) رۆژ بروسکەیان کردبوو، کە بەرمان بدەن.

ئازادیانکردین‌و پێیان گوتین:

"دەبێ ئاگامان لە هەموو هەڵسوکەوتتان بێ."

ئێمەش گەڕاینەوە ماڵەوەو چەند ڕۆژێ لە خانووەکەدا بووین، کە لەنێوشاردا بوو.

ئێمە ماوەی پێنج ساڵ بە ماڵەوە لە (ئێران) بووین. هەرچەند خەڵکی (مەهاباد) زۆر ڕێزیان لێدەگرتین، بەڵام کاربەدەستانی حکومەت زۆر فشاریان خستبووە سەرمان. ئیدی ناچاربووم بگەڕێمەوە بۆ (سوید)و لە هەوڵی ئەوەدابم منداڵەکانم بگەیەنمە ئەوێ‌و لەوێ جێگیربین تا بزانین وەزعەکە دەگاتە کوێ.

ئەوە بوو، دوای شەش مانگ هەموو منداڵەکانم بردە (سوید)و لەوێ ماینەوە تاکو دوای ڕاپەڕین.

لە مانگی دووی/١٩٩٢ گەڕامەوە بۆ کوردستان. پاش چەند ڕۆژێ چوومە هەڵەبجەو سەردانی گۆڕستانی بە کۆمەڵ کوژراوو بێتاوانی هەڵەبجەم کرد، ئەو هەڵەبجە جوانەی شوێنی سەدان کەڵەپیاوو نووسەرو شاعیرو خاوەن دیوەخان‌و خانەدان بوو. بەڕاستی ئەوەندە کاری تێکردم ئەو شارە جوانەم بەو شێواوی‌و وێرانییە بینی، کە چەندین ژن‌و منداڵ‌و پیاوی باشی تیاچوو بوو. ئەوەشی لەوێدا مابوون، بێ جێگەو ڕێگەو سەرلێشێواو بوون، لە خێزانێکدا یەکێ، یان دوانی مابووەوەو هی وایش هەبوو هیچی نەمابوو. بەڕاستی هەر کەسێکی بەویژدان پێشتر هەڵەبجەی دیبێ‌و دوای ئەو کارەساتەش ئاگای لە وەزعی خەڵکەکە بێ، هەرگیز ئەو تاوانە گەورەیەی بەرامبەر بە خەڵکی هەڵەبجە لە دڵی

کرد، ئه‌و هه‌ڵه‌بجه جوانه‌ی شوێنی سه‌دان که‌ڵه‌پیاوو نووسه‌رو شاعیرو خاوه‌ن دیوه‌خان‌و خانه‌دان بوو. به‌ڕاستی ئه‌وه‌نده کاری تێکردم ئه‌و شاره جوانه‌م به‌و شێواوی‌و وێرانییه بینی، که چه‌ندین ژن‌و منداڵ‌و پیاوی باشی تیاچوو بوو. ئه‌وه‌شی له‌وێدا مابوون، بێ جێگه‌و رێگه‌و سه‌رلێشێواو بوون، له خێزانێکدا یه‌کێ، یان دوانی مابووه‌وه‌و هی وایش هه‌بوو هیچی نه‌مابوو. به‌ڕاستی هه‌ر که‌سێکی به‌ویژدان پێشتر هه‌ڵه‌بجه‌ی دیبێ‌و دوای ئه‌و کاره‌ساته‌ش ئاگای له وه‌زعی خه‌ڵکه‌که بێ، هه‌رگیز ئه‌و تاوانه گه‌وره‌یه‌ی به‌رامبه‌ر به خه‌ڵکی هه‌ڵه‌بجه له دڵی ده‌رناچێ. ئێستاش هه‌ڵه‌بجه که له هه‌موو دنیادا، به‌هۆی ئه‌و کاره نامرۆڤایه‌تییه‌وه، که به‌رانبه‌ر خه‌ڵکه‌که‌ی کرا، بۆته جێگه‌ی فه‌خرو شانازی بۆ خه‌ڵکی کوردستان به‌گشتی‌و خه‌ڵکی هه‌ڵه‌بجه خۆی به‌تایبه‌تی.

مانگی ٧ی ١٩٨٦ لە نەخۆشخانەی شاری (لینشۆپینگ) لە سوید

# قاچێکی دەستکرد

رۆژی ١٩٨٦/١/١ چومە شاری (لینشۆپینگ)، سێ هەفتە تێپەڕی کردو سەرلەنوێ نەشتەرگەرییەکی دیکەی قاچیان کردم. کە برینەکەم چاك بووەوە، ئەوجا قاچێکی دەستکردیان بۆ کردمو بەردەوام پەراوەیان پێ دەکردم لە بەکار هێنانیو رۆشتن پێوەی. پاش ئەوە بە دوو مانگێ پاسپۆرتی (سوید)یم وەرگرت. لێیان پرسیم، کە چ شارێکی (سوید)م پێ خۆشە لێی نیشتەجێبم بۆ ئەوەی رەوانەی ئەوێم بکەن. من لە راستیدا خۆم نەمدەزانی چ شارێ بۆ نیشتەجێبوونم باشە. لەبەر ئەوە بە پێشنیاری زۆربەی برادەران شاری (ئۆپسالا)م هەڵبژارد. لەوێ برادەران خانوویان بۆ جێبەجی کردم.

زۆر لە برا کوردەکان بەردەوام سەردانی نەخۆشخانەو ماڵەوەیان کردم، بەتایبەت بەڕێز (عومەر شێخ موس)و کاك (حەمە چاوشین)و مامۆستا (مەحمودی مەلا عیزەت)و کاك (عومەری سەید عەلی)و (شێخ مەنسووری حەفید)و زۆر برادەرو دۆستی دیکە.

حەمەی فەرەج لە نەخۆشخانەی لینشۆپینگ لە سوید ١٩٨٦

پێشمەرگەکانی شۆڕشی چەکداریی ئێران لە نەخۆشخانەی لینشۆپین لە سوید
لە کاتی بەڕێکردنی کاکە حەمەی فەرەج دا

بەرلین ١٩٨٦/٥/٢٩ لەگەڵ مامۆستا مەحمودی مەلا عزت

بەرلین ١٩٨٦/٥/٢٩ لەگەڵ هاورێم کاك صەلاح رەشید
وەزیری مافی مرۆڤی حکومەتی هەرێم

# سەردانم بۆ کوردستان

گەیشتنی ئەو هەواڵە جەرگ بڕە کارەسات و کوێرەوەریەکی گەورە بوو بۆ من، هەواڵێکی دڵتەزێنی هەرگیزاو هەرگیز چاوەڕوان نەکراو بوو. ئەو هەواڵە هێندەی دیکە باری تەندروستیمی تێکشکاند. هەرچەندم دەکرد خۆم پێ ڕانەدەگیرا. لە (ئۆپسالا)دا هۆڵێکی گەورەمان گرت و پرسەیەکی گەرممان بۆ دانا. دوای ئەو کارەساتە پشت شکێنە داوام لە برادەران کرد، کە بە هەر جۆرێ بێ دەبێ سەردانی کوردستان بکەمەوەو بچمەوە بۆ نێو ماڵ و منداڵەکانم. ئەو دەمە خێزانەکەی خۆم و خێزانی شەهید (عبدولڕەحمان)ی کوڕم و هەردوو کچەکەی (ئەحمەد)ی خێزانی برام و (ئەرسەلان)ی کوڕم، هەموو لەدێی (مالومە)و (باڵخ) بوون.

بە خەم و پەژارەیەکی زۆرەوە بەرەو کوردستان کەوتمە ڕێ. لەوێ بیرم لە چارەسەرێ دەکردەوە بۆ ئەو خێزانە گەورەیە. ئەو دەمە شەڕیش لە کوردستاندا زۆر گەرم بوو. ڕۆژانە تۆپباران دەکراین، ناچار هەموو جار لە دێیەکە دەردەچووینە دەرەوە، هەروەها شەڕی (قەیوان)و (ماوەت) زۆر بە گەرمی و خەستی دەستی پێکردبوو. بیرم کردەوە، کە هەندێ لە منداڵەکان بە نهێنی بنێرمەوە بۆ (سلێمانی)و هەندێکیشیان لەگەڵ خۆمدا بەرمە ئێران.

دوای شەهید بوونی عەبدولرەحمانی کوڕم لە نزیك گڵکۆکەی پاش دوو هەفتە شەهید بوونی لە گەرەدێی ناوچەی شارباژێر

# چوونی خۆم و خێزانەکەم بۆ ئێران

ئێمە چووینە ئێران‌و لەوێ چووینە (قەرارگەی رەمەزان). نامەیەکی (ئاغای رەحیمی)م وەرگرتبوو، کە لەوێ کاروبارەکانی پێ راپەڕێنم‌و داوام کردبوو، کە بچین لە شاری (مەهاباد) دابنیشین. (قەرارگەی رەمەزان) بەوە رازی بوو، کە بچینە (مەهاباد)و نامەیەکیشیان دامێ بۆ فەرمانداری شاری (مەهاباد)، سەبارەت بە دەزگاکانی دیکەش گوتیان، کە خۆیان پەیوەندییان لەگەڵدا دەبەستن.

لە (مەهاباد) نامەکەم بردە لای فەرمانداری‌و ئەوانیش رازی بوون بە مانەوەمان‌و لەوێ چووینەماڵی کاك (جەلال ئاغا)و دوو سێ شەوێ لەوێدا ماینەوە. لای پارکی (کوودەك) خانویەکیان بۆ پەیدا کردین‌و هەندێ شتی ناوماڵمان کڕی. پاش مانگێ لە دەزگای (ئیتلاعات)ەوە بانگیان کردین، پرسییان چۆن هاتووینەتە ئەوێ. پێمان گوتن: بە فرمانی (قەرارگەی رەمەزان)و رازی بوونی فەرمانداریێتی. گوتیان: "بۆ خەڵکێکی زۆر هاتووچۆتان دەکەن؟"

پێم گوتن: "پرسەمان هەیە بۆیە ئەو خەڵکە زۆرە دێنە لامان."

گوتیان: "لەمەو پاش هەرکەس بێتە لاتان، بەر لەوە دەبێ بێتە لای ئێمەو ناوی بنوسین، هەر کاتێکیش خانووەکەت گواستەوە، دەبێ لە

ناونیشانی نویٚ ئاگادارمان بکەی، هەر کاتێکیش خۆت بە لایەکدا رۆیشتی، هەردەبیٚ ئاگادارمان بکەیت."

ژانو ئازاری قاچم بەرەو زیادبوون دەچوو. لە بەر ئەوە بڕیارمدا، کە بگەڕێمەوە (سوید).

حەمەی فەرەج لەگەڵ بەڕێز مام جەلال لە مەهاباد ١٩٨٩

# گەڕانەوەم بۆ سوید

ئەو دەمە ساڵی ١٩٨٧ بوو، منداڵەکانم لە (مەهاباد) جێهێشتو پێم گوتن: ئەگەر (قەرارگەی رەمەزان) پرسیاری کرد ئەوا لە گەڕانەوەم بۆ (سوید) ئاگاداریان بکەن پاش ماوەیەك منداڵەکانم خانویەکی باشتریان دەست کەوتبوو هەڵبەت لە گواستنەوەیان دەزگا ئێرانیەکانیان ئاگادار کردبوو، دوای سێ مانگ خۆشم دیسانەوە گەڕامەوە بۆ ئێران.

سەرلەنوێ (ئیتلاعات) ناردیانەوە بە دوامداو بەوە تاوانباریان کردم، کە خەڵکێکی زۆر هاتووچۆمان دەکەن. ئاگادارم کردنەوە، کە ئەوانە کوردی عیراقنو ناسیاوو برادەرمنو منیش نەهاتوومەتە وڵاتەکەتان نەخشەو پیلانێکی دژ بە ئێوەم هەبێ، بەڵکو بە رازیبوونی خۆتان هاتوومەتە ئێرە. ناونیشانی تازەی ماڵەوەیان لێوەرگرتمو کاتژمێرێکی نەبرد هەموو منداڵەکانیان هێنایە (ئیتلاعات). گوتیان: "هەمووتان دەنێرین بۆ (خویی)." منیش گوتم: "ناچین" بۆیە ماوەی دوو رۆژ زیندانییان کردین. بیرم لەوە کردەوە دەستوبردانە ئاگاداری (مام جەلال) بکەم، کە لە (قاسمەڕەش) بوو، یاخود کاك (رەفعەتی مەلا)، کە نوێنەری

یەکێتی بوو لە ئێران، تا لەو کارە ناڕەوایەی (ئیتلاعات)ی مەهاباد دژ بە ئێمە ئاگاداربن.

باش بوو (مام جەلال)و کاك (رەفعەت) ئاگادارکران، ئەوانیش ئاگاداری ئێرانیان کرد. پاش چەند رۆژێ بەریاندایین‌و هەر لە (مەهاباد) ماینەوە. پاش ئەو وەزعە نالەبارە، بڕیارماندا موعامەلەی پێویست بۆ منداڵەکان چی بکرێ تا بێنە (سوید). هەر لە رێی سەفارەتی (سوید)ەوە لە (تاران) هەوڵی جێبەجێکردنی کاری منداڵەکانمان داو خۆشم گەڕامەوە بۆ (سوید). هەر لە (سوید) داوای هاتنی منداڵەکانم کرد، کە باری تەندروتسیم خراپەو پێوستم بە یارمەتیدانی ئەوان هەیە. دوای چەند مانگێ ڤیزەو ئیقامەیان بۆ ناردنە سەفارەت لە تاران‌و رۆژی ١٩٩٠/٦/٥ گەیشتنە (سوید) بۆلام. پاش هەوڵێکی زۆر منداڵەکانی شەهید (عەبدلڕەحمان)ی کوڕیشم لە١٩٩٠/٨/٢٠ هاتنە (سوید). هەموو خێزانەکە لە شارۆچکەیەکی بچووك بە ناوی (هێبی) کۆبوونەوە.

لەراستەوە: شەهید عوسمان دزەیی، عەزیز عومەر (بەرێوەبەری گشتیی کشتوکاڵی سلێمانی)، کاکە حەمەی فەرەج، شێنێ (کچی ملازم کەریم سلام)

# خاپورکردنی گەڕەکی کانیی ئاشقان

لە ئەنجامی تاوانەکانی رژێمی بەعس دژ بە خەڵکی بێ دیفاعی گوندەکانی کوردستان‌و دەرکردنی بڕیاری راگواستنی هەموو گوندەکانی ناوچەی هەڵەبجەو شارەزوور بەو گوندانەشەوە، کە زۆر نزیکن لە سەر جادەی گشتیی (هەڵەبجە - سەید سادق). دوا بەدوای دەرکردنی ئەم بڕیارەش، رژێمی بەعس جەماوەری هەڵەبجە، بۆ ئەوەی بە دوژمنانی نەتەوەی کوردی بسەلمێنێ، کە هەستی نەتەوایەتیی جەماوەر بە راگواستنی گوندەکان لەنێو ناچێ. ئەوە بوو لە شەوی ١٢/١٣ی مانگی پێنجی ساڵی ١٩٨٧ لە بڵندگۆی مزگەوتەکانەوە رێکخستنەکانی نێوشار بانگەوازیان بۆ جەماوەری شارکرد، کە بۆ رۆژی دوایی دوکان‌و بازاڕ نەکەنەوە، هەموو جەماوەری شاریش بەدەم بانگەوازەکەوە هاتن‌و لە بەرواری ١٣/٥/١٩٨٧ راپەڕین دەستی پێکرد.

رێکخستنەکان وا بڕیاریان دابوو، کە راپەڕین دژی بەعس لەنێو شاردا لە دوو لاوە دەست پێ بکا. ئەوەبوو لە کاتژمێر ٨ی بەیانییەوە لە قوتابخانەی ناوەندیی کوڕانی شارەزوور لە گەڕەکی (کانیی عاشقان)، بەشێکی جەماوەر کۆبوونەوەو بەشەکەی تریشی لە خوێندنگەی ئامادەیی (هەڵەبجە)ی کوڕان لە گەڕەکی (کانی قوڵکە) کۆبوونەوە. راپەڕینی جەماوەری شار لە هەردوو بنکەکەوە لەیەك کاتدا دەستی

پێکردو لە ناوەندی شاردا بەیەك گەیشتن‌و شەڕو پێکدادان لە نێوان جەماوەری راپەڕیوو رژێمی بەعس دا دەستی پێکردو لە ئەنجامی دەستڕێژی گوللەی تانکی داگیرکەراندا هەر لە ناوەندی شاردا خوێندکار (مەریوان حمە رشید) شەهید کراو بووە یەکەمین شەهیدی ئەو راپەڕینە.

بەشێکی زۆری شار کۆنترۆڵکراو هێندەی نەمابوو شار بە تەواوی ئازاد بکرێ، بەڵام لەبەر نەبوونیی چەك‌و هێزی پێشمەرگە، کە ئەوەندە ببێ بتوانێ بەرگری لەو راپەڕینە بکا. راپەڕینەکە سەرکەوتنی تەواوی بەدەست نەهێناو هەر لە کاتژمێری یەکی پاش نیوەڕۆی هەمان رۆژدا رژێمی بەعس بێ بەزەییانە بەربووە گیانی جەماوەری بێ دیفاعی شار بە تۆپ‌و تانك‌و هەلیکۆپتەر لە ئەنجامدا راپەڕینی جەماوەر سەرکوت کرا. بەهۆی قەسفی هەلیکۆپتەرو تۆپباران هاووڵاتی قادری کاکە ئەحمەد کۆکۆیی لە گەڕەکی (شێخ ئیسماعیل) شەهید بووو ژمارەیەکی زۆری خەڵك بریندار بوون. کە پتر لە (٣٠) کەسیان لە نەخۆشخانە بە برینداری دەستبەسەر کران. پاشان هەر بە زیندویی لە پشتی گوندی یامۆك کران بەژێر خاکەوە. پاش راپەڕین تەرمەکانیان لەلایەن جەماوەرەوە دۆزرایەوە، وەك (عوسمانی خاوەر، عوسمانی علی حاجی سالح) لەگەڵ برازایەکی داوای لێبووردن لە کەس‌و کاری شەهیدەکانی تر دەکەم، کە ناوەکانیانم لەبیر نەماوە.

شیاوی باسە، بۆ پشتگیریی ڕاپەڕینی هەڵەبجە، جەماوەری شاری (قەڵادزە)ی خۆشەویستیش وەك پیشەی هەمیشەییان لە ڕۆژی دواتر ڕاپەڕینیان بەرپاکرد. ئەوە بوو پاشان ڕژێمی بەعس ژمارەیەکی زۆری هاووڵاتیان لە هەڵەبجە دەستگیرکرد بە بیانوی ئەوەی، کە لە ڕاپەڕینەکەدا بەشداریان کردووە، کە زۆربەیان گەنج بوون و پاش ئازار دانێکی زۆر ئازادیان کردن. هەر لەهەمان ڕۆژدا ڕژێمی بەعس تەواوی گەڕەکی کانی عاشقانی بە دینامیت تەقاندەوەو بەسەر یەکداو زۆربەی ماڵەکانیش تەنانەت پێش ئەوەی ئەشیاکانیان بێننە دەرەوە بیناکانیان بەسەردا ڕوخاندن، کە ژمارەی خانووەکانی ئەم گەڕەکە پتر لە ٣٠٠ خانوو دەبوو، ڕژیم وای تەقاندەوە، کە پاشان کەس نەی دەزانی سنووری ماڵەکەی خۆی کامەیە.

هەڵەبجە لەمە زۆرتری بەسەردا هاتووە. ساڵی (١٩٨٧) زوڵم و زۆریی حکومەت وای کردبوو لەو خەڵکە، کە ناچاربوون خۆپیشاندان بەرپابکەن و چەندین کەس هاتنە سەر جادەکان و دەستیان بە گرتنی ڕێگاکانی نێوشارو دروشم گوتن دژی داگیرکەران کرد. حکومەتیش بە دۆشکەو تانك دەستی بە تەقە کردو خەڵکەکەی تۆقاندو زۆریان ڕایانکرد بەرەو گەڕەکی کانیعاشقان. پاشان (جەیش و جاش) کەوتنە نێو شارو لە مزگەوتی (جامعە) بەولاوە کەوتنە گەڕان، ماڵ بەماڵ و هەرچی تێدابوو بردیان و دەستیانکرد بە تاڵان و بڕۆی خەڵکەکە تا

گەڕەکی مۆردانەو پاشان دەستیان کرد بە روخاندنی خانووەکان بەسەر خاوەنەکانیانداو. لەو هەلْمەتەدا خەلْکێکی زۆریان کوشت، فڕۆکەش لەسەرەوە بۆردومانی دەکرد بێدەست پاراستن لە هیچ کەس. ئەمە بووە هۆی کوشتن‌و بریندار بوونی ژمارەیەکی زۆرو هەموو خانووەکانی گەڕەکی کانی عاشقانیان تەقاندەوە. هەروەها هەندێ لە بریندارەکان لەگەڵ ئەوکەسانەی لەگەڵیاندا بوون بە ناوی چارەسەرکردنەوە بە هەلیکۆپتەر بردنیان‌و پاش چەند رۆژێ بە زیندوێتی کردنیان بەژێر خۆڵەوە لە سەروی هەڵەبجەوە لە رێی (کانی شێخ)ی بامۆك لای (حەوزی بەلۆعەکە). لەو شەهیدانەش: عوسمان عەلی حاجی ساڵح‌و برازاکەی حمە تایەرو سەیید باقی‌و عوسمانی خاوەری عەرەبانچی، کە زیاتر لە (١٠) کەس دەبوون. پاشانیش پاسەوانیان دانا بەدیار قەبرسانەکەوە بۆ ئەوەی کەس نەچێ تەرمەکان دەربهێنێتەوە. هەندێکی‌تر لەو خەڵکانە توانییان بە پێی پەتی‌و سکی برسی هەڵهاتن بەرەو سنووری ئێران‌و بەو حاڵە ناخۆشە توانیان خۆیان لەدەست دوژمن دەربازبکەن. ئەمەش کورتەیەك بوو لە مێژووی ٤٠ ساڵەی هەڵەبجەو ئەو مەینەتی‌و ناسۆری‌و ناڕەحەتیانەی، کە بەسەریدا هاتوون.

# کیمیابارانی هەڵەبجە

لە کاتی شەڕی درێژخایەنی (ئێران - عێراق)دا ئەوە بوو لە ١٩٨٨/٣/١٤ هێزەکانی ئێران هێرشێکی بەربڵاویان هێنا لە چەند لایەکەوە بەرەو هەڵەبجەو خورماڵ، بە نیازی ئەوەی بەنداوی دەربەندیخان بگرن ئەوەندەی کە من ئاگادارم لە سەرەتادا بە تۆپی دوورهاوێژ دەستی کرد بە قەسفێکی توندو تیژ بەرەو هەڵەبجەو دەوروو بەری، کەچەند سەربازگەیەکی عیراقی لەو ناوچەیەدا بووو ئەمانیش وەڵامیان دەدانەوە بە تۆپو تانكو چەکی هەمەجۆر. لە ئەنجامی ئەم شەڕە تۆپەدا زۆر جار ناو شارەکە بەر تۆپ دەکەوتو چەندین خەڵکی بێ تاوان شەهید کرانو بریندار بوون.

لە دوای دوو ڕۆژ شەڕە تۆپی خەستی هەردوولا ووردە ووردە هێزەکانی عیراق ئەشکانو هەندێکیان ڕای دەکردو ژمارەیەکیان لێدەکوژراو بریندار دەبووو هەندێکیان لێ بە دیل دەگیراو دەبران بەرەو سنوور.

لە ئەنجامدا لە ١٩٨٨/٨/١٥ شاری هەڵەبجە کەوتە ژێردەستی هێزەکانی ئێرانو زەرەرو زیانێکی زۆر لە خەڵکی بێ تاوانی ئەو شارە کەوت.

پاشان لە ڕۆژی دواییدا، کە ڕێکەوتی ١٩٨٨/٣/١٦ دەکا لە کاتژمێری (١١,٢٠)دا فڕۆکەیەکی میکی ٢١ی عیراقی هاتو خولێکی کرد بەسەر شارەکەدا بۆ کەشفو ڕۆیشت.

بەڵام لە کاتژمێری ١٢ای نیوەڕۆدا چوار فڕۆکەی عیراقی هاتو گەڕەکی سەرای بە ساروخ بۆمباباران کرد، ژمارەیەکی زۆر خەڵکی بێ تاوانی شەهید کردو هەندێکیتریش بریندار وون. هەموو خەڵکەکە سەریان لێ شێواو نەیاندەزانی بەرەو کوێ بچن، چونکە دەیان زانی ئەوە تەواو نابێو هەر بەردەوام قەسف دەبێ. بەم شیوەیە قەسف بەردەوام بوو. لە ماوەی دە دەقیقەداو شەش، تا حەوت فڕۆکەیتر دەهاتو بە ساروخو ناپاڵم شارەکەیان بۆمباباران دەکردو دەگەڕانەوەو کۆمەڵێ فڕۆکەیتر دەهات. ئەمە بەردەوام بوو هەتا سەعات ٣,٢٠ دەقیقە بۆ ئەوەی هەموو خەڵکەکە بچێتە ژێرخان وەك جاران، کە لە ترسی تۆپو ساروخ خۆیان دەشاردەوە. دوای قەسفی ساروخو ناپاڵم. ئینجا بۆ ئەوەی کەس رزگاری نەبێ بە کیمیاوی قەسف دەستی پێکرد تا کاتژمێری ٦ی ئێوارە. بەڕاستی کارەساتێ بوو بەسەر ئەو شارەدا هات، نە خامە نە زمان ناتوانێ بە تەواوی ئەو حاڵەتە باس بکا، تەنها ئەو خەڵکە خۆی نەبێ، کە لە نێو کارەساتەکەدا بوون.

لە ئاکامی ئەم زوڵمو زۆرە ناڕەوایە زیاتر لە (٥٠٠٠) هەزار کەس شەهید بوون لە ژنو منداڵو پیرو گەنجی ئەو شارە هەزارانیتریش بریندار بوون، کە زۆریان کوێر بووبوون یان لەشیان سووتابوو بە کیمیاوی، ئەوەشی رزگاری بوو، بە پێی پەتیو بە برسێتیو بێ کەلو پەلی ژیان بە سەرلێشێواوی کۆمەڵ کۆمەڵ بەرەو سنوورەکانی ئێران

بەرێ کەوتن. لە رێگادا بە دەیان تراکتۆرو سەیارە دەبینران، کە خەڵکەکەی ناوی شەهید بووبوون بە کارگەریی کیمیاویەکە. ئەمەو سەدان رووداوی دڵتەزێنیتر، کە لە رێگەدا دەبینران، کە هەر خێزانێ بە شێوەیەك لێی قەوماوەو جۆرەها شێوە بریندارو سووتاوو جەرگ سووتاوو شتیترت بەرچاو دەکەوت. بەڕاستی کارەساتی وا کەم روویداوە، کە دژ بە خەڵکی بێ گوناهی شارێکی ئاوا بکرێ.

ئەمە تاوانێکی ئەوەندە گەورەبوو، کە رژێمی فاشستی بەغدا دژ بە گەلی کورد کردی، ئێمە جگە لەو هەموو تاوانانەیتر، وەك ئەنفال‌و گرتن‌و تۆقاندن‌و لەسێدارەدان، کە دەرحەق بە گەلەکەمان ئەنجامی داوە. ئەوە بوو، ئەم تاوانە گەورەیەی دژ بە شاری هەڵەبجە دنیای هەژاندو زۆربەی زۆری دەوڵەت‌و گەلانی دنیا دەنگی نارەزاییان بەرزکردەوەو بەجارێ داوای دادگایی دەکەن بۆ رژێمی عیراق‌و پەیوەندیان لەگەڵ بڕیوەو بە هەموو شێوەیەك دژایەتیی رژێمەکە دەکەن. لە بەرامبەریشدا هەموو دنیا پشتگیریی گەلی کورد دەکەن‌و داوای جێبەجێکردنی مافەکانی گەلی کورد دەکەن‌و کۆنگرەی جیهانی دەبەسترێ، بەتایبەت بە گەلی کوردو داکۆکی لە مافەکانی دەکرێ بە جۆرێ، کە دەنگی کورد گەیشتۆتە هەموو دنیاو کارەساتی ئەم شارە بووە هۆی بە جیهانیکردنی کێشەی کورد. بەڵام تاکو ئێستا وەك پێویست هیچ شتێکی سیاسیان بۆ نەکردووین لەکاتێکدا هەموو

لایەکیان باس لەوە دەکەن کێشەکەمان ڕەوایەو پێویستی بە پشتگیریی وڵاتانی دنیا هەیە.

شەهید شەماڵ ئەحمەد قـادر

۱۹۸۸ دوای کیمیابـاران لە نێوان سەید سادق و هەڵەبجەدا شەهید بوو

**شەهید شاهۆ ئەحمەد قادر**

**لە ساڵی ١٩٨٨ لە شاری هەڵەبجە شەهید کراوە**

شەهید کەژاڵ ئەحمەد قادر

لە ساڵی ١٩٨٨ لە شاری هەڵەبجە شەهید کراوە

# راپەڕینو ئازادکردنی کوردستان

ئازادیی کوردستان خەوی سەرجەم نەتەوەپەرستانو ئازادیخوازانی کورد بوو. عیراق لە ئەنجامی شەڕێکی سەختی خوێناویدا، بۆ ماوەی هەشت ساڵ ماڵوێرانیو خەڵك بە کوشتدان کەوتبووە ژێر باری قەرزارییەکی زۆرەوە. لە ئەنجامی لەخۆباییبوونو غەڕاییی، ویستی بەهۆی داگیرکردنی (کوێت)ەوە، بە پارەو پولی نەوتی (کوێت)، ئەو قەرزانەی سەرشانی سووك بکاو ئابووریی داتەپیوی عیراقو باری ژیانی دواکەوتووی ٨ ساڵ شەڕ، کەمێ بەرز بکاتەوە.

ئەوەبوو بەو بیانووەی، کە (کوێت) بەشێکە لە عیراقو لێی جیانابێتەوە. (کوێت)ی گرت، هەر زوو (ئەمریکا)و هاوپەیمانانی ئاگاداریان کردەوە، کە بە زووترین کات لە (کوێت) بکشێتەوە دواوە. بە سەدان نێردراوی دەوڵەتیو جیهانیو رۆژنامەنووسان سەردانی عیراقیان کرد، داوایان کرد، کە لە (کوێت) بکشێتەوە، بەڵام غەڕاییو لەخۆبایی بوونو بیرنەکردنەوە لە ئەنجامی کارەکە، وای کرد (ئەمریکا)و هاوپەیمانانیو کۆمەڵێ لە دەوڵەتە عەرەبیەکان لە هێرشێکی سەختدا لە (کوێت) دەری بپەڕێننو سەربازو ئەفسەرێکی زۆری لەنێو ببەنو هەرچی تانكو تەقەمەنیو کەلو پەلێکی زۆری سەربازیو جەنگی هەیە ووردوخاش بکەن. سەرەڕای بۆردومانکردنی

دامەزراوە گشتیو بەرهەم هێنەرەکانی نێو عیراق خۆیشی. لە ئەنجامی ئەم تێکشکانە خێرایەدا ناڕەزاییو تەقینەوەی خەڵکی خوارووی عیراق گەورەترین راپەڕینی جەماوەری لە شارەکانی وەك (بەسرەو عەمارەو کوتو نەجەفو کەربەلا)و هتد... دروستکرد، ئەوەندەی نەمابوو هێرشی جەماوەری راپەڕیوو بەغدای پایتەختیش بگرێتەوەو کورسیی حوکم لەتو پەت ببێ. پاش ماوەیەکی کەم لە کوردستانیش بڵێسەی گڕی راپەڕین لە (رانیە)وە دەستی پێکردو جەماوەر توانییان لە ماوەیەکی زۆر کەمدا شاری (رانیە) کۆنترۆڵ بکەنو زۆربەی کاربەدەستەکانی رژێم بگرنو ئەویتریشی کوژرانو لەناوچوون.

پاش دوو رۆژ جەماوەر لە (سلێمانی)ش راپەڕین شاری (سلێمانی)یان لە رۆژی ٧ی ئازاردا کۆنترۆڵ کردو هەڵیانکوتایە سەر دامودەزگاکانی ئەمنو ئیستخباراتو لە ماوەیەکی زۆر کورتدا ئەوەی بەردەستیان کەوت کوشتیان. بەوە راپەڕین سەرتاسەری کوردستانی گرتەوەو شارو شارۆچکەکان یەك بەدوای یەکدا دەکەوتنە بەردەستی جەماوەر. هەولێرو دهۆك ئازادکرا. پاشتریش شاری (کەرکوك)یشی گرتەوە. جەماوەری خەڵکی کوردستان بەشێوەیەك راپەڕیبوو رقو کینەی ٢٣ساڵی ژێردەستەیی دەتەقاندەوەو وەك لافاو دەزگا کارتۆنییەکانی بەعسی رادەماڵی، یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانو سەرجەم پارتە

سیاسیەکانی کورد رۆڵێکی بالآیان له نهخشهکێشان‌و هاندانی جهماوەرو بهشداری سهرتاسهری راپهرینهکهدا ههبوو.

یهکێتیی نیشتمانیی کوردستان به چهند ههفتهیهك لهوه بهرهوه شانه چهکدارهکانی خۆی له ژێر نهخشهیهکی دیاریکراودا رهوانهی شارو شارۆچکهکانی کوردستان دهکرد. به نهێنی ههڤاڵ (نهوشیروان مستهفا) به نامه پهیوهندیی به شانه چهکدارهکانی نێو شارو شارۆچکهکانهوه دهکرد، به سهرۆك جاش‌و عهشیرهتهکانیشهوه، که له رۆژی راپهریندا پهیوهندییان پێوه دهکرێ‌و راپهرین‌و رزگاربوون له کۆت‌و پێوهندی بهعس.

ههر له یهکهم ساتی بیستنمانهوه لهو دووره وولآتانهوه، که راپهرین بهرپابووهو جهماوهر توانیویهتی داموو دهزگاکانی رژێم بروخێنێ، دهقیقه بهدوای دهقیقه له چاوهرێی ههواڵی سهرکهوتنی دیکهدا بووین. من وهك کوردێ، که ههمیشه به ههست‌و گیانم لهگهڵ بیری ئازادیی نهتهوهکهمدا بووم، وێنه به وێنه چاوم له رووداوهکان بوو، بهلآم چی لهگهڵ قهدهردا بکهم، که من هێشتا لهژێر چارهسهری قاچم‌و ئهو پارچانهی له گیانمدا بوون خهریك بووم، دهبوو ههموو جارێ به چهند ماوهیهك بههۆی نهشتهرگهریی ئهو شوێنانهی لهشم، که هێشتا پارچه تۆپیان تێدا مابوو، له نهخۆشخانه بۆم تیمار بکهن‌و بۆم دهربهێنن. ئهمه ماوهی ئهوهی نه ئهدام بێمهوه وهك پێشمهرگهیهك بجهنگم بۆ

گەلەکەم، ئەو ئازادکردنەی کوردستان خەوێ بوو، کە هەموو کوردێکی بە شەرەف سات بەسات لە گەڵیدا دەژیا.

پاش ئەوەی رژێمی بەغدا کەوتەوە خۆیو بە هۆی چلکاو خۆرانیو گاردی کۆمارییەوە وەكو گورگ بەربووە گیانی میللەتو بەهۆی وەستانی شەڕی کەنداوەوە زیاتر هێزی سەربازی نارده ئەو ناوچانە، شار بە شاری خوارووی عیراقی گرتەوەو زۆر دڕندانە کەوتە گیانی جەماوەری راپەڕیوو بەشێکی زۆری لێ کوشتنو لێ رەمی کردن. پاش ئەوە هێرشێکی بەربلاوی کردە سەر کوردستانیش، خەڵکی بەشەرەفی کوردستان دلێرانە لە زۆر ناوچەدا بەرەنگاریان بوونەوە، بەڵام بۆ ئەوەی، کە خوێن زۆر نەڕژێو شارەکانی کوردستان خاپوور نەبن. وا بەباش زانرا، کە سەرتاسەر شارو شارۆچکەکان چۆڵ بکرێن بەوە کۆڕەوێکی دوو ملیۆنی خەڵکی کوردستان بەرەو ناوچەدوورەکانی کوردستانی باشوورو ناوچە نزیکەکانی کوردستانی رۆژئاواو باکوور دەستی پێکرد. ئەم کۆڕەوەی جەماوەر، لە هەموو دنیادا دەنگی دایەوەو بووە هۆی ئەوەی هەموو ئاژانسەکانی دنیا بە کوردەوە خەریك بنو شێوەی ئەو هەموو خێزانە ئاوارەو سەرلێشێواوو دەربەدەرو ماڵوێرانە، لە ئێستگەکانی تەلەفزیۆنی دنیاوە پیشاندەدراو لە زۆربەی شارەکانی ئەوروپادا خۆپیشاندانی کوردو دۆستەکانی روویدا.

رژێم شارو هەندێ لە شارۆچکەکانی کوردستانی گرتەوەو لە ئەنجامدا سەر لەنوێ وتووێژو دانوسان لە نێوان بەرەی کوردستانیو رژێمدا دروستبووەوە بەوە خەڵکەکە وردەوردە هاتنەوە ناو شارو جێگاکانی خۆیان، کە بەشێکی زۆری تالآن کرا بوو.

جەماوەری کورد کەژانو ئازارێکی زۆری بەدەست رژێمی فاشیستی بەغداوە چێشتبوو، بە هەر جۆرێك رازیبوونە بەوەی پارتیو یەکێتیی حوکم بگرنە دەست. ئەوەی زۆر گرنگ بوو بۆ کورد ئەوە بوو، کە شەڕی براکوژی روونەدا. منیش وەك کوردێ هیوام هەمیشە ئەوە بوو، کە قەوارەیەکی سیاسی کوردستانیی پێکبێ. بەوپەڕی خۆشحاڵیەوە پیرۆزبایی‌ی گەرمم لە خۆمو هەموو نەتەوەی کورد کرد، پێم وابوو ئیدی ئاسۆی رووناکی کورد هەڵهاتو لەژێر دەستەیی‌و سیاسەتی فڕکردن رزگارمان بوو، بڕیارمدا بگەڕێمەوە کوردستان. ئەوەبوو، لە مانگی مارتی ١٩٩٢دا سەردانی کوردستانی ئازادم کردەوە. چوومە شاری هەڵەبجەو کاری یەکەمم سەردانی ئەو گۆڕستانە بوو، کە بە کۆمەڵ کوردی ژێردەستەی ستەمدیدەی تێدا نێژرابوو، ماتەمینیەکی زۆر سەرتاپای لەشی داگرتم، لە هەمان کاتیشدا دڵم بە گەڕانەوەکەم خۆشبوو، کە بۆ جاری یەکەم لە ژیانمدا هەوای کوردستانێکی ئازادی بێ رژێمی داگیرکەری بەغدا هەڵدەمژم. لە شارە خۆشەویستەکەمدا، کە جێگای باوباپیرانم بوو.

لەوێ (مام جەلال)و (هێرۆ خان)و کاك (کۆسرەت رەسوڵ)و (مولازم عومەر)و کاك (عومەر فەتاح) سەردانیان کردم. ئەو دەمە لەماڵی کاك (عەلی مەلا محەمەد) بووم. (مام جەلال)، گوتی: "حەمە ئەوا ئیدی شارەکەت رزگاری بوو، هەوڵ دەدەین هەموو کەم‌و کورپییەکانی دابین بکەین."

منیش پێم گوت: "مام جەلال تەماشای ئەم شارە خنجیلانەیە بکە چیی بەسەرهاتووە، ئومێدەوارم بتوانن چارەسەری تەواو بۆ خەڵکی سەرانسەری کوردستان بدۆزنەوەو لەگەڵیاندا بەوەفا بن، بیر لەوە بکەنەوە کار بدەنە خەڵکانی لێهاتوو بە توانا، کە بەرێوەی بەرن. داواکانی خەڵك لەبیر نەکەن. دەبێ بۆ هەموو لایەکی بسەلمێنن، کە شۆرش بۆ جەماوەری کورد کراوە، نەك بۆ کۆمەڵێ لە سەرکردایەتی‌و ئەندام‌و لایەنگرانی حیزبەکان." لەوەڵامدا پیێ گوتم: "کە بەهاوکاری گشت لایەك هەنگاو بۆ ئەو مەبەستە دەنێین‌و تۆش لەم بارەوە دەبێ هاوکاریمان لەگەڵدا بکەی."

من بێگومان ئامادەیی‌ی خۆمم لە هەموو خزمەتێدا نیشاندا، کە پێم بکرێ.

دواجار سەردانی (قەڵاچوالان)م کرد. (مام جەلال) لەوێ پێی گوتم: دەیەوێ دەزگایەکی کۆمەلایەتی دابمەزرێنێ بۆ جێبەجێکردنی گیروگرفتی ناوچەکان وەك لێکۆڵینەوە لە گیروگرفت‌و کێشەی

عەشیرەتەکان، چاوپێکەوتنو کۆبوونەوەکردن لەگەڵ پیاوماقوڵانو پیاوە ناسراوەکانی کوردستانو بەسەرکردنەوەی کەسایەتیە ئاینیەکانو... هتد. ئەو دەزگایەش بریتی بێ لە (١٠-١٥) کەسو بەسەرکردایەتی (مام جەلال) خۆی بەڕێوە بچێ.

پاش لێکۆڵینەوە، لەسەر ئەو مەسەلەیە، من لای خۆمەوە بە باشم زانی لەو خزمەتکردنەدا هاوکاری بکەم. ئەنجام منیان کردە لێپرسراوی چەند ناوچەیەك وەك: (هەڵەبجە، شارەزوور، پێنجوین، دەربەندیخان، بەرزنجە، هەورامان). بۆ بەڕێوەبردنی ئەو کارانە، لیژنەیەکم لە کەسایەتییە ناسراوەکانی ئەو ناوچانە پێکهێنا. مەلاکانی ئەو ناوچانەمان خرکردەوەو یارمەتیو پێداویستیەکانمان بۆ دابین کردن، یارمەتیدانی خێزانێکی زۆری شەهیدانو لێقەوماوانمان تا رادەیەکی باش دەستەبەرکردو ئەم کاروبارانەمان تا ساڵی ١٩٩٤ بە رێکوپێکی بەڕێوە دەچوو، بێ ئەوەی هیچ جیاوازیەك لە نێوان یەکێتیو پارتیو لایەنەکانی دیکەماندا کردبێ، بە تایبەتی ناکۆکیو کێشەی زۆری نێو عەشیرەتەکانمان جێبەجێ کرد، وەکو کوشتنو کۆمەڵێ ناکۆکیو حاڵەتەکانی دیکە.

مامۆستا فەیسەڵ

لە ساڵی ١٩٩١ لە راپەڕینەکەدا شەهید بوو لە تاسڵوجە

# گه‌ڕانه‌وه‌م بۆ کوردستانی ئازاد

مانگی ئازاری ١٩٩٢، به دڵێکی خۆشه‌وه گه‌ڕامه‌وه بۆ کوردستان، که ئاواتی چه‌ند ساڵه‌ی خۆم‌و خێزانه‌که‌م بوو. ئه‌م ئازادییه به چاوی خۆمان ببینین. دوای چه‌ند رۆژێ چووم بۆ شاری هه‌ڵه‌بجه‌و ماوه‌یه‌ك له‌وێ مامه‌وه، زۆر دڵخۆش بووم به‌وه‌ی له پاداشتی خه‌باتی چه‌ند ساڵه‌ی خۆم‌و هاوخه‌باته‌کانم، ئه‌م ئازادییه له کوردستاندایه ببینم.

ئه‌و ماوه‌یه‌ی له‌وێ بووم، به‌بێ ترس هاتووچۆی زۆر شوێنم ده‌کرد، بێ ئه‌وه‌ی بیر له هیچ شتێ بکه‌مه‌وه، که به‌رامبه‌رم بکرێ. پاش ماوه‌یه‌ك چه‌ند دۆستێ هاتنه‌لام پێیان گوتم:

"ئاگاداری خۆت بکه‌و به بێ پاسه‌وان بۆ هه‌موو شوێنێ مه‌چۆ."

به‌ڕاستی منیش سه‌رم سووڕما، پرسیم:

"بۆچی؟:

پێیان گوتم: "جاشه‌کان له زۆر شوێن باسیان کردووه، که (حه‌مه) باوکی کوشتووین‌و ده‌مانه‌وێ تۆڵه‌ی لێبکه‌ینه‌وه."

منیش زۆر گوێم به قسه‌کان نه‌دا. رۆژێ له‌لایه‌ن (ده‌روێش ئاغا)وه، که به‌رپرسی پارتی بوو له سلێمانی، هه‌واڵی بۆ ناردم، که کوڕو که‌س‌و

کاری جاشەکانی دەوروبەری هەڵەبجە هاتوونەتە لام‌و شکاتیان کردووە لێم!

منیش پێم گوت: "بۆچی شکاتیان لێ کردووم؟"

گوتی: "ئەوان گوتوویانە: (حەمە) باوک‌و برای کوشتووین."

منیش پێم گوت: "من هەرچییەکم کردبێ ئەوکاتە بۆ شۆڕش کردوومە، کەس ئاش‌و باخی لێ داگیرنەکردووم، ئەی بۆ ئەو هەموو پێشمەرگانەی، کە شەهید کراوە ئێمە شکات لەکێ بکەین؟"

ئەویش داوای لێبوردنی کردو گوتی: "هاتوونەتە لام‌و ئیزنم داون."

پاشان هەواڵم زانی، کە ئەوانە کەوتوونەتە جموجوڵ. ڕۆژانە من دەچوومە دەرەوەو بەیانیان زوو لەبەر ماڵەکەی خۆماندا پیاسەم دەکرد. کوڕێ بە ناوی (حەمە ساڵح) گوتی:

"(حەمە) بەیانیان زوو مەیە دەرەوە، چونکە کەسانێ چاودێریت دەکەن."

خۆشم هەروەها زانیاریم هەبوو، کە چەند جارێ هاتوونەتە دەوروبەری ماڵی ئێمە بۆ چاودێری. ئەو کاتە ئەوانە سەر بە پارتی بوون. منیش لە رێی (دەروێش ئاغا)وە ئاگادارم کردن:

"ئەگەر بیانبینم لەم ناوە تەقەیان لێدەکەم بۆ ئاگاداریتان."

ئەمەیش بۆ ئەوەی نەبێ بە کێشە لە نێوان پارتی‌و یەکێتیدا، چونکە ئەوانە کوڕی ئەو پیاوە تاوانبارانەن، کە دەستیان سوورە بە خوێنی

سەدان پێشمەرگەو ئێستاش لە کاتی ئەم ئازادییەدا، کە ئاوات‌و ئامانجی هەزاران خەڵکی تێکۆشەرە دەیانەوێ تۆڵەی باوکیان بسێننەوە."

# دەڵێن ( حەمە ) باوکی کوشتووین

لە مانگی (گەلاوێژ)ی ساڵی ١٩٩٣دا بوو، لە (سلێمانی) لەماڵەوە دانیشتبووم میوانم هەبوو، برای بەڕێز کاك (جەمال ئاغا) لەگەڵ (جەلال عەلی ئاغای زڕگوێز)دا هاتنە لام. کاك (جەمال ئاغا) پارچەیەك کاغەزی دایە دەستم، تەماشامکرد چەند ناوێکی تیابوو، گوتی: "ئەمانە هاتوون بۆ لای ئێمە بۆ مەڵبەندو شکاتیان کردووە، دەڵێن (حەمە) باوکی کوشتووین."

منیش رووم کردە (جەمال ئاغا)و پێکەنیم، گوتم: "کاك جەمال من کەسم بۆ خۆم نەکوشتوە، ئەگەر هەر چیم کردبێ لەپێناوی میللەتەکەمدا کردوومە، بەلام هەر پێم خۆش بوو لێت بپرسینایە، باوکی ئەوان چ کارە بووە، کە من کوشتوومە؟"

ئەویش وەلامی دامەوەو گوتی: "من پێم گوتوون بەیانی بێنەوە وەلامتان دەدەمەوە."

میوانەکانی، کە لام دانیشتبوون (بورهانی کوێخا حسێنی هەناران و کاك شێخ تاڵیبو حسێن حەمە ساڵح)و چەند پیاوێکی‌تر بوون. سەریان سوڕما بوو لەمە، گوتیان گوایە دەبێ ئازادی وابێ، کە لەبریی ئەوەی پاداشتی خەڵکە کوردپەروەرەکان بدرێ، دەبێ دادگایی بکرێن؟ گوتیان

باشه ئەی ئێمه شکات له کێ بکەین، ئەو هەموو کوڕو براو کەس‌و کارانەمان شەهید بوون، کێ بەرپرسیارە لەمەو داوای حەقەکەمان لەکێ بکەین؟!

شەهید نەمرە وەکو شاخ،
وەکو بەفر، وەکو درەخت،
وەکو بەهارو گوڵەباخ.
شەهید ئاوە
تینوێتیی زەوی ئەشکێنێ.
پەنجەو دەستە
ئازاری خاك رائەژەنێ.
سۆمای چاوە
کام دوا رۆژ دوورە ئەبینێ.
شەهید باڵای
بەقەد باڵای کوردستانە،
دڵی ئازادی و بەیداخی
لووتکەی هەڵوێستی
ئینسانە.

# ژیاننامەی شەهید عەبدولڕەحمان

شەهید عەبدولڕەحمان له سالّی ١٩٥٤ لەشاره دلگیرەکەی هەلّەبجە، پەراوێزی کراسه شینەکەی شنرویّو تاجی سەری شارەزووردا چاوی به ژیانی پڕ دەردەسەریو زەبرو ستەمی داگیرکەر هەلّهێنا.

شەهید عەبدولڕەحمان هەر وەکو خۆم له بۆتەی ناکۆکییه دژوارەکانی نێوان دەرەبەگو جوتیاره ڕەشو ڕووتەکاندا، لەژێر زەبری چەوساندنەوەی نەتەوایەتیو له گەلّ نالّەو نرکەی تاوانلێکراواندا سەری هەلّبڕیوه. هەر بۆیه مەلاشوی بەگیانی بەرگریو تۆلّه هەلّدراوەتەوە. ئا ئەوه بووه یەکەم نامەی سوورو له مستی نرا بۆ گەیاندنی به لوتکه.

له سالّی ١٩٦١دا لەگەلّ هەلگیرسانی ئاگری شۆڕشی ئەیلوولدا، که من بوومه یەکێ له پێکهێنەرانی دەسته سەرەتاییەکان پێشمەرگەی شۆڕی ئەیلوولو ڕووم له چیا سەرکەشەکانی کوردستان کرد، ئەو دەمه عەبدولڕەحمان منداڵێکی نۆ سالان بووه، له کۆلانی گەڕەکی پیر محەمەد له هەلّەبجه به تفەنگی دارو قەوانه فیشەکی بەتالّ دەکەوتۆته یاری کردنو دیار بوو به شانازیەوه لاساییکەرەوەی منی پێشمەرگه بوو. خۆشترین کاتیش نیوەشەوان بوو، که بەدەم قرمەژنی گوللەوه له قوولایی خەو ڕاچلەکیوەو چاوەڕوانی گەڕانەوەی من بوو.

ئیتر عەبدولڕەحمان هەر لەو دەمەوە لەگەڵ مندا بوو بە هەڵۆی سوورو هۆگری برسێتیو نەبوونی. یەکەم ووشە دوای ناوی خۆیو من، کە فێری بوو، وشەی (کوردستان) بووە.

لە ساڵی ١٩٦٤دا ئەم هەڵۆ سوورە خوێنی بەناهەق رژاوی شەهید (ئەحمەد)ی برامو مامی خۆی بە چاوی خۆی بینی، کە بە دەستی رەشو گوللەی غەدری جاشە نەفرەت لێکراوەکان مەرگی پیرۆزی بە باڵا بڕا، تەنها هەر لەبەر ئەوەی کوردو کورد پەروەر بووو تەنها لەبەر ئەوەی چاوەگەشەکانی بە سیمای دزێوی داگیرکەردا هەڵنەدەهاتو هیوای رزگاربوونی کوردستانی کردبوە گۆرانییەکی خۆش ئاواز. ئەمە گەورەترین کارەساتی جەرگ بڕ بوو، کە دڵی عەبدولڕەحمان ی پێ داخکراوەو بە قووڵی هەستی پێدەکرد.

لە ساڵی ١٩٦٨دا عەبدولڕەحمان، بوو بە مێرمنداڵە. هەر کە بە خۆیدا رایبینی شانی چەك هەڵگریو توانای ئەوەی بوو خەمی گەورەو کەسەری قورس بکاتە کۆڵ، وازی لە خوێندنی قوتابخانە هێناو پۆلی یەکەمی ناوەندی بەجێ هێشتو لەگەڵ مندا بوو بە پێشمەرگە. ئیدی هەردوو پێکەوە بووینە دوو هاوڕێی رێی تێکۆشان. هەر ئەو دەمە، هەردوو پێکەوە بە یەك دڵو هەناسە بەڵێنماندا دابێ تا کاروان بەڕێوەبێ پێشمەرگە بینو ئیدی نەسرەوین.

له ساڵی ۱۹۷۰دا، له پاش رێككه‌وتنی پارتی‌و حكومه‌تی به‌غداو ده‌ركه‌وتنی به‌یاننامه‌ی یانزه‌ی ئازار، كه به‌هۆیه‌وه باری سیاسی‌و شه‌ڕی كوردستان هێدی‌و هێمن بووه‌وه، عه‌بدولڕه‌حمان رووی كرده شاری هه‌ولێرو له‌وێ بووه فه‌رمانبه‌ر له ده‌زگای ئاگركوژێنه‌وه. له‌پاڵ ئه‌و كاره‌شیدا به شه‌و درێژه‌ی به خوێندنه‌كه‌ی دا تا پله‌ی سێ‌ی ناوه‌ندیی بڕی. به‌ڵام ئیدی ناچار به‌هۆی ئه‌وه‌ی كه شه‌ڕی كورد له ساڵی ۱۹۷٤دا هه‌ڵگیرسایه‌وه، ده‌ستبه‌رداری فه‌رمانبه‌ریه‌كه‌ی‌و خوێندنی شه‌وه‌كه‌ی بووه‌وه به پێشمه‌رگه.

له‌و ساڵه‌دا، كه رژێمی پارتی به‌عسی سۆشیالیست له‌پاش چوار ساڵ ته‌قه وه‌ستان، هه‌ر ئاماده نه‌بووه به‌ڕاستی مافه‌كانی گه‌لی كورد بچه‌سپێنێ، عه‌بدولڕه‌حمان وه‌كو هه‌ر رۆڵه‌یه‌كی هۆشیاری‌تر رقێكی پیرۆز دژی ئه‌و رژێمه نه‌ژادپه‌رسته ئاگری به‌ردایه دڵی، بۆیه خۆی له تفه‌نگه‌كه‌ی‌و تفه‌نگه‌كه‌ی له خۆی گه‌رمتر به پیریی تۆڵه‌سه‌ندنه‌وه رۆیشت‌و رووی كرده‌وه شاخ. له نه‌به‌ردو داستانه‌كانی قه‌ره‌داخ‌و شاره‌زوورو جاده‌ی سلێمانی- عه‌ربه‌ت‌و گه‌رووی بێشێ‌و گه‌ڵاڵه‌دا، شێرانه هاوبه‌شیی كرد.

له ساڵی ۱۹۷٤، كه شه‌ڕ له‌گه‌ڵ حكومه‌تدا ده‌ستی پێكرد، من له (قه‌ره‌داخ) بووم، له سه‌ركرایه‌تیه‌وه داوایان كردین، كه هێزه‌كه‌مان بچێ بۆ ئه‌وێ. له مانگی ۱۲/ ۱۹۷٤دا چووین‌و گه‌یشتینه (سه‌رتیز)و (بێشێ).

لە سەرتیز (عەبدوڕەحمان)ی کوڕم لەگەڵ مندا بریندار بوو، پارچەیەك لە گوللەی تۆپ لەسەر سنگی ئەودا هەر مابووەوە. هەر بە سۆی ئەو زامەوە یەکەمین کۆڕپەی خۆی ناو نا (سەرتیز).

دکتۆرەکان پێیان دەوگوت: "پێویستت بە ئیسراحەت هەیە."

بەڵام خۆی پێ نەدەگیراو دانەدەنیشت، هەر داوای ئەوەی دەکرد بگەڕێتەوە بۆ لای من بۆ پێشمەرگایەتی. ئەوکاتە ماڵمان لە (سەرپێڵی زەهاو) بوو، هەموو رۆژێ دەیگوت دەگەڕێمەوە بۆ لای باوکم. دوای هەرەسەکە، کە گەڕاینەوە بۆ کوردستانی عیراق لەنێو شاردا. (۲) دوو هەفتەی نەبرد دەستی کردەوە بە ئیشی نێوشارو لەگەڵ کۆمەڵەی رەنجدەراندا دەستی دایە کاری رێکخستن.

لە ساڵی ۱۹۷۵، لە رۆژە تاڵەکانی نسکۆدا، کە نائومێدی سەری کردە گیانی زۆربەی کۆمەڵانی خەڵك، ئەم وەك تینویەك کەوتە گەڕان بەشوێن چکێ ئاودا تا گەرووی وشك هەڵاتووی پێ تەڕ بکا، ئاویش بەدوای گەرووی ئەوانەدا دەگەڕا، کە رزگاریی گەل‌و نیشتمانیان کردبووە بەرزترین ئامانج‌و گەورەترین رێبازی ژیان‌و کوردایەتی. هەر بۆیە دوای ماوەیەکی کەم لە یەکێ لە شانەکانی رێکخستنی (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان) رێکخراو.

لە ساڵی ۱۹۷۸دا، هێندە نەبەردو قارەمان بوو، لە ئەنجامی دڵسۆزی‌و کارامەیی کرا بە ئەندامی (کەرتی شەهید کاروان)و لە ماوەی ئەم

ساڵەدا گەلێ چالاکی ڕێکخراوەیی نواندو توانی چەندین ئەندامو دۆستو لایەنگر ڕێك بخا.

لە ساڵی ١٩٧٩ لەسەر داوای خۆی گوێزرایەوە بۆ شانەیەکی‌تر، کە کاروباری دەستوەشاندنو چالاکیی نهێنی گرتە ئەستۆ. لەبەر ئازایەتی‌و لێهاتوویی کرایە لێپرسراوی یەکێ لە مەفرەزەکانی (تۆڵە)و لە چەندین چالاکیی ناوشاردا قارەمانانە بەشداریی کرد. تا مانگی شەشی ساڵی ١٩٨١ لەو شێوە چالاکییانەدا بەردەوام بوو. پاشان بەهۆی ئەوەی، کە مەترسیی زۆر لەسەر ژیانی دروست بوو، دیسان گوازرایەوە بۆ شانەیەکی‌تر بۆ ئەنجام دانی کاری سیاسی.

لە مانگی چواری ساڵی ١٩٨٤دا، عەبدولڕەحمان، پاش ئەوەی لەلایەن دوژمنەوە دەستنیشان کرا، ناچار لە نێو شاری سلێمانی‌دا بە نهێنی مایەوەو لە شوێن‌و جێگای نهێنیدا خۆی حەشاردا. لە مانگی هەشتی ئەو ساڵەشدا نێو شاری سلێمانی‌ی بەجێهێشتو ڕووی کردە شاخو پەیوەندیی بە هێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە کرد. لە شاخدا لەبەر لێهاتوویی‌و ئازایەتی، هەر زوو بەزوو توانی جێگەی خۆی لە نێو ڕیزەکانی پێشمەرگەدا بکاتەوە. دوای ماوەیەك کرایە جێگری فەرماندەی کەرت لە سنووری مەڵبەندی یەك.

شەهید عەبدولڕەحمان، کە لە شاخ بوو، ڕۆژانە بیری لەوە دەکردەوە لەگەڵ هاوڕێکانی چۆن بێنە نێو شارو دەست لە دوژمن بوەشێنن.

ئەوەبوو، لە مانگی یانزەی ساڵی ١٩٨٢ بۆ ئەنجامدانی چالاکیەك لە نێو شاری سلێمانی، لەگەڵ هاورێ (مەلا باپز) دابەزینە نێو شار، لە بەردەم مزگەوتی (عەبدەللا لوتفی) رووبەرووی شەڕێکی دەستەویەخە بوون. لە ئەنجامدا (مەلا بایز) شەهید بووو (عەبدورەحمان) بە سەختی برینداربوو. تەرمەکەی (مەلا بایز) دەست (مولازم موحسین) کەوت.

عەبدولرەحمان هەر بەو برینە سەختەوە توانی دوو لە سیخورەکانی دوژمن بپێکێو کەلاکیان بخا.

ماوەیەکی کەم، دوای ئەم رووداوە، عەبدولرەحمان کرا بە فەرماندەی (کەرتی شەهید مەلا بایز).

لە ساڵی ١٩٨٣دا لە شەڕێکی دەستەویەخەدا لەگەڵ جاش‌و ئیستخباراتدا لە قرگە (قرگە) لە (سلێمانی)دا روویدا، لەو شەڕەدا عەبدولرەحمامنی کورم جێگری فەرماندەی تیپ بوو. ئەو شەڕە بەهۆی شەهیدبوونی (١٨) پێشمەرگە بە رێکەوت. بەڵام (عەبدولرەحمان‌و خولەی حمە جان‌و ئەرسەلان) رزگاریان بوو.

لە ساڵی ١٩٨٥، پاش چەند چالاکیەکی‌تر بە رێك‌و پێکی‌و پەیرەوکردنی یاسای پێشمەرگایەتی‌و بەشداریکردنی قارەمانانەو هەڵکەوتووانەی لە شەڕی (کورەداوێ)دا، کرا بە جێگری سەرتیپی ٤٧ ی پیرەمەگروون.

ساڵی ١٩٨٦، لە دوا رۆژەکانی یەکەمین مانگی ئەم ساڵەدا، لە شەوی ٢٦ لەسەر ٢٧ی مانگی یەکدا، لەگەڵ دەستەیەك لە هاورێکانی چووە نێو

شاری سلێمانیو پاش ئەوەی دەستی کاریگەری خۆیان وەشاند، گوللەی دوژمنی بەرکەوتو شەهید بوو. هاورێکانی هەر ئەو شەوە تەرمە پیرۆزەکەیان بەجێ نەهێشت تا بەردەستی چەپەڵی دووژمن بکەوێو لەگەڵ خۆیاندا بردیان لە گۆڕستانی شەهیداندا لە گوندی (مالومە) بە خاکیان سپارد.

(عەبدولرەحمان) لە چەندین شەڕی جۆراوجۆریتردا بەشداریی کرد. بێ ئەوەی بیر لە بەرژەوەندیی خۆی بکاتەوە، هەرگیز حسابی بۆ دوژمنو تواناو دەسەڵاتی نەدەکرد، زۆر حورمەتی منی دەگرتو زۆر رێزی لێدەگرتم. بەڵام نەمدەتوانی قەناعەتی پێبکەم، کە دابنیشێ. هەرچەند پێم دەگوت خۆت بپارێزە، بەڵام ئەو شەهیدیی بۆ خۆی هەڵبژاردبوو. ئەگەر بمایە چاوەڕوانی زۆر شتی چاکی لێدەکرا بۆ میللەتەکەمان.

# ٣٣ بەهار

شیعری: محمەد حەمە باقی

(بەبۆنەی چلەی ماتەمینیی هاوڕێی شەهیدم کاکە عبدولڕەحمان ی حەمەی فەرەج)

(١٩٨٦/٢/٢٧ مێولاکە)

١

ئەگەر ویستتان یادم بکەن،
سووك دەستبەرن، پەنجەرەی زامی دڵەکەم بکەنەوە،
ئەلبوومێکی بیرەوەریی منی تیایە،
مێژوویەکەو پڕ لە ڕووداو،
وەکو مێژووی نیشتمانەکەی خۆم وایە.
لە جیاتیی خۆم، سەیری ئەوکەن،
گەلێ یادگارمی تیایە.

٢

یەکەم پەڕەی: وێنەی منە لە هەشتساڵما،
لەگەڵ باوکمام.
دەستی گرتووم بەناو گوڵزارو درەختی - باخی میر- دا ئەمگەڕێنێ.
لە چاوی - باخی میر- ەوە
هەستی خۆشویستیی جوانیی و
هەستی خۆشویستیی جوانیی کوردستانم ئەوروژێنێ..
- باخی میر- یش کچۆڵەیەکی جل سەوزی قەزوانی‌یە
تا دڵ حەزکات.
جوانیکە نوقمی جوانی‌یە..
ئیتر هەر لەو رۆژانەوە.. هەتا ئێستەش
من و - باخی میر- ی نازدار
بووین بە هاوڕێی گیانی بەگیانی، نا ببورن، بووین بە دڵدار.
لەو رۆژەوە عەشقی منالیی ئەو باخە
لەگەڵ گەورەبوونی خۆما،
وەکو سەرم،
وەکو دڵم،
وەك هەموو ئەندامی لەشم،

هەتا دێ گەورەتر ئەبێ و توندتر ئەیگرمە باوەشم.
لە ئاوێنەی رەنگاوڕەنگی ئەو باخەوە
درەخت و گوڵ و باڵندەی گەرمیان و کوێستانم خۆش ویست.
هەر لە چاوی ئەو باخەوە هەموو کوردستانم خۆش ویست.

٣

دووەم پەڕەی: وێنەی منە لە تەمەنی یانزە دوانزە ساڵانیما
بە تەنیام، وام لەناو سووتووی دارو بەردی،
باخە سووتاوەکەی میرا،
لە پاڵ کۆتە دارێکی لەش هەڵقرچاوی دڵگیرا..
کز دانیشتووم. نامەیەکم لە دەستدایە.
نامەی باوکم،
بۆی نووسیوم
کوڕە جوانە قژ زەردەکەم.
بەندی جگەرو هەناوم
کارژۆڵەی لە پاش جێماوم،
کە دیم هەژدیهای داگیرکەر
دەروونی پڕ لە ئاگرە،

ئاگری شەڕ..
دەستم دایە تفەنگێك و رووم کردە شاخ
تا نەهێڵین بسوتێنن بزەی منداڵ و گوڵەباخ.

٤

سێیەم پەڕەی: وێنەی منە، تەمەن هەر پانزە ساڵانم.
لەگەڵ باوکم و هاوڕێکانیا راوەستاوم.
یەکە مجارمە، ئاوا قیت و قۆزو وریا
جامانە توند بیەستمەوەو تفەنگیش بکەمە شانم.

٥

چوارەم پەڕەو پێنجەم و، هەتا سی و سێهەم
ئیتر هەموو وێنەی منن، لە هەمووشیانا پێشمەرگەم
وێنەکانم هی نەبەردی قەرەداغ و شارەزووروگەرووی بێشی و
سەرتیزو ناو شارەکانە.
لەهەمووشیانا، لە ریزی سەنگەری پێشەوەم.

٦

ئەو وێنانە. وێنەیەکیان هی - سەرتیزە -
جوان سەیری کەن، لەسەرمەوە تا بەری پێم، هەمووی سوورە.
ورد ببنەوە، ئەوە سورایی‌ی زامێکی جەستەی خۆم بوو
دڵۆپە خوێناویەکان یەك یەك لەسەر پێستم
بوونەتە گوڵاڵە سوورە.

٧

سەیری لا پەڕەی سی و سێ کەن، وێنەی دار تەلێکی گەشە،
لە - تووی مەلیك -
پە پولەیەك بە چوار دەوریا ئەخولێتەوە...
ئەو چرایە کوردستانە و،
ئەو پە پولەیەش هەر منم

٨

دوا وێنەی سەر بەرگی دواوە
وێنەی منە بە شەهیدی،
لەگەڵ هەموو شەهیدانا رێك بە پێوە راوەستاوین،

ئەم زەمینە گەورەیەمان
لەسەر پشتو سەرسەری خۆمان داناوە.
ئێمە ئەو ئەفسانەیەمان پووچ کردەوە،
کە ئەیان ووت:
زەوی لەسەر پشتی ماسیو جووتیٚ گایە!
ئەو ئەفسانەیە درۆ بوو.
چونکە زەمین، لەسەر سەری شەهیدان راوەستاوە.

٩

کە وێنەکانتان سەیر کرد،
ئەلبوومەکەم لە پەنجەرەی زامی دڵما دانێنەوە.
وێنەی:
سەرتیز و
سەرخێڵ و
سەرهێزی
سیٚ کوچکەی رۆحم لا جیٚ بێڵن.
ئەوسا هێمنو لەسەر خۆ،
پەنجەرەکە داخەنەوە.

لە راستەوە: سەرخێڵ، سەرهێز، حەمەی فەرەج، سەرتیز

لە راستەوە بۆ چەپ: سەرهێز، سەرخێڵ، سەرتیز

# داستانی هەڵۆی پیرە مەگروون

شیعری: هەلکەوت

(پێشکەشە بە گیانی هەمیشە زیندووی شەهید عبدولڕحمان محەممد فەرەج، ئەو شێرە نەڕە، کە دواکۆتیان کردە گەردنی، بەلام نرکەی هەر ئەمێنێ.)

(رەشەمێو نەورۆزی ١٩٨٦)

<u>لەقتەی گشتی:</u>

(چاوی کامیرا گەلایەکی گەشی سەوز ئەبینێ، کە شنە بایەکی هێمن لەنجەی پێ ئەکات. لەگەڵ دوورکەوتنەوەدا پەل و پۆو لق و گەلاکان تا سەرتاپای درەختەکە دەرئەکەوێت.)

درەختێکی بەرشیرینو
گەلا سەوزو پەل و پۆ سوور.
قنج راوەستاو لەسەر قەدی بەرزو ئەستوور.
فەرشی سێبەرێکی گەورەی
بە چوار دەوریا راخستووە.
سەرتۆپەکانی گۆنایان

بە رووی خۆردا هەڵخستووە.

پەیتا.. پەیتا

زریانێکی شێتو تووڕە خۆی لێ ئەدا.

چەند لەشکری تووڕەبوونی تەیار ئەکاو بە گژیا دێ،

هەر بەرهەڵستی ئەکاتو

خۆی لەبەریدا رائەگرێ.

هەر درەختێ

بە دەمارو رەگی سەوزی خۆشەویستیی

پێی لە زەوی داکوتابێ،

گیانی کرمەڕێز نەبێتو

چرۆی گەشو نوێی لێی دابێ،

چۆن بە هاشەو گڤەی زریان بەلادا دێ؟

**لەقتەی نزیک:**

(چاوی کامیرا بەسەر چەند لادێیەکی بێ نازو دەیان خەڵکی رەنجدەرو لاپاڵو دوندو رەوەزی پیرەمەگروون دا ئەگەڕێ، تا لەسەر هەڵۆ ئەگیرسێتەوە.)

لاوێکی باڵا قەشەنگو پۆڵاو

مووزەردو سوور.

وریاو وەكی تریش هێمن،

چاو ئەگێڕێ بەرو دواو.. نزیك‌و دوور.

چەند مەخزەنیّ بەقەدەوەو،

تفەنگ لەشان

قالْ بوو، كارامەو، پارتیزان.

وەك سەرقەتار

پۆلیّ پێشمەرگەی ( پیرەخەو ) لە چاو تۆراو

بەدوایەوە.. ئەڕواو ئەڕوا.

جیّ پێكانی ئەو ریّ‌و بانە

گوڵرێژ ئەكا.

ئەڕواو ئەڕوا...

پڕ بە پڕی سیەكانی

شنەی دۆڵی رووت هەڵئەمژیّ‌و

سڵاوی هەڵۆ نوستووەكان..

ئەگەیەنیّ بە حەزرەتی - مامەیارە - و

ملە یاقوتیّ ئەكاتە

گەردنی بۆ خۆر بڵند بووی كچی - سەیوان -.

**لەقتەی سلۆمۆشن:**

شار.. بوکێکی سەرو کڵاو شێوێنراوە.

سێوە لاسوورەیroomەتی

بە ماچی تاڵ روشێنراوە

شەللاتیەکانی تکریتی.. نوقم بووەکانی بێ ناموسی و،

دەڵالەکانی بازاڕی ساختەچێتی،

ئەوانەی دایکیان شاژنی تیاترۆخانەو،

باوکیان پارە وەرگرێتی.

کلافەی پرچی داهاتووی هەڵئەکێشن و،

هەمووی تاڵ... تاڵ

ئەکەن بە قەیتانی پۆستاڵ.

(لێرەوە چاوی کامیرا ئەچێتە سەر بووکێکی هەش بەسەر، کە لە روخسارو سەرتا پای باڵایدا جێ پەنجەی تاوان دیارە، کزۆڵ کزۆڵ دانیشتووەو ئەژنۆی گرتۆتە ئامێزی.)

بوکێ چاوی خوێن ئەرێژێ،

رووی لە کڵاوی زیوینی

بان سەری پیرەمەگروونەو

لەو لووتکەوە شنەی هیوا هەڵئەمژێ.
فرمێسك پۆلێ کۆتری سپی دەنووك سوورن
بەسەر گومەزی کوڵمەوە ئەگمێنن..
ئەم سروودە نوێیە ئەڵێن:
ئێمە کێینو.. ئەوانیش کێن..؟
ئێمە ئاڵتونی کانێکی لە مێژینەی ئەم دنیایەین
ژەنگی هەموو.. سەدەو چەرخەکا نمان دیوە.
چەند فەرهەنگی ووشەی رزیو
وەکو لەشکری هۆلاکۆ هاتووە بۆمان
پەڕە پەڕەیمان دڕیوە.
وەکو خاڵی لاملی کەو
وەك چاوی بەبیون و مێخەك،
جوانی خۆمان پاراستوە.
وەك چیاو دۆڵ.
وەك دەوەن و گوێزو بەڕوو،
وەك پێشمەرگە.. ناوی خۆمان نەگۆڕیوە.

(لێرەوە هێدی هێدی دیمەنەکە دوور ئەکەوێتەوە، تا وردە وردە ئەبێتە تۆپی مانگێکی هەڵواسراو بە ئاسمانەوە.)

ئەوانیش خلتەی شەرابی بێ ویژدانیو،

ئەڵقەی تەڵەی نائینسانین.

هەردەم بە چاوی چنۆکو،

چنگی وێزو،

شەقاوی دڕندانەوە..

هاتوون بە پیر داواکانمانەوە

نامانەوێن.

(چاوی کامیرا ئەچێتە سەر شار، بە کۆڵانو شەقامو ماڵەکاندا ئەگەڕێ. هاوکات لەگەڵ ئەو گەڕانە هێمنەدا ئەم دەنگە ئەبیسترێ.)

وەرە ڕۆڵە...

سەری کاسم ڕاوەشێنە..

بە تیشکی گوللەی گڕدارت

چاوی گڵۆپی بێ نووزەی ماڵەکانم.. داگیرسێنە.

وەرە ڕۆڵە..

گێژەنەی دەرگای داخراوم بکەرەوە.

وهڵامی ئازاو مهردانهی
تاوانهکان بدهرهوه.
وهرهو رستێ پشکۆ بێنه
بۆ سهر لێوی له تینوا ههڵپرووکاوم.
په نجهت بێنهو بیکه به شانهی پهرچهمی ئاڵۆزکاوم.
بیکه به قرپهو برێشکه...
بهبێ دهنگی گوێم کهڕ نهبێو
به خوێن ئهکرێ
ئارایشتی دهم و چاوم.

(جادهی - توی مهلیك - سهرنجی چاوی کامیرا رائهکێشێ. ههموو شتێ رقی تۆڵه سهندنهوهی لێ ئهبارێو تهنانهت قوتابخانهی - ئاشتی- یش شهڕ ئهفرۆشێ.)

چهك وهك ئهمان، ئهمانیش وهك چهك، لهسهر پێ.
لهسهرسووچی کۆلانێکا به گوێی یهکدا ئهچرپێنن.
برێ جهندرمهی بێ یاساش
لهو سهرهوه. به نووکه رم
نهخشی تاجه ئاڵتونیهکهی.. سهری - مهلیك - ئهروشێنن.

تەقە هەڵسا..

بوو بە شەڕی دەستە و یەخەو،

چرای ناخی شار داگیرسا.

ئەمان شێری لەلان دەرچووی

دەم بە دروشمی نەبەزین.

ئەوانیش دەستەیەك سەگی

کللك شۆڕی دەم بە وەڕین.

گوللە ئەهات.. گوللە ئەچوو

تا یەکێکیان هەڵۆی پێکاو،

سەری سنگی بە خوێن سوور بوو.

گوللە باران خۆشی نەکرد

تا لمۆزی ئەوان شکاو، بۆی دەرباز بوون.

ئەمانیش تەرمی هەڵۆیان.. گەڕانەوە بۆ ئامێزی پیرەمەگرون.

**لەفتەی نزیك:**

دوێنیٚ شەو - سەرتیز - خەوی دی"

لە خەویدا

پیرەمەگروون تاشێك لەشانی کەوتە خوار!

وهك كانيهكى چاو قژراڵى ئهم كوێستانه

چۆن ديارى دهستى نابهكار،

ههموو رۆژێ لێلى ئهكا.

ئاوا خهوه پهمهيى يهكهى. رهنگى گۆڕا.

بهيانى، كه لهخهو ههڵسا

چاوهكانى ههڵگوفتو رووى ماتى كرده خۆراوا.

بينى دهستهيهك ههڵۆى چاو گۆمى خوێن.

به دارمهيتێكى سورهوه

بهرهو مالومهى جهمال دێن

**لهفتهى دوور:**

دهوروبهر تا چاو ههتهركا

گوڵباران و چاوو راوه.

ئاشتى كهنارى چهمێكى بههارانهى ئهم خاكهيه

له گوڵى خهرمانهى داوهو

له ستهمى باروترپێژى دهستى ناحهز

بهجێ ماوه.

شادى دهريايهكى سپيى راكشاوه،

( خەم ) ددانێکی کلۆرو دارزیوی هەڵکێشراوە،
مەگەر هەر لە ناخ و دڵی
ئەوانەدا تۆوی مابێ..
کە خەڵکی ئەم وڵاتەن و بە غەریبی لەو نلوەسەریان هەڵداوە.

(دوای گەڕانێکی خێرا بەناو شاردا چاوی کامێرا ئەچێتە سەر دەرگایەك. )

ئوتێلێکی چەند نهۆمی
بەلەمی سەرسنگی دەریای ( لین شۆپینە )و
لە ژورێکا ئەویش دڵتەنگ، لەسەر قەرەوێڵەیەکی.. متیل سپی
بەسەر قاچە ساغەکەیا.. شانی پرشکۆی داداوە.
چاوە شاراوەکانی ژێر
برۆ رەش و پڕەکانی.
بڕیوەتە پارچە زەویەکی بەردەمی و
لە چەند خشتێکی کاشیدا
ئەم وڵاتە سك سوتاوە ئەبینێت و
لەگەڵ تاسانی هەر چەم و جۆیبارێکا،
لەگەڵ سوتانی هەر مێرگ و نزارێکا،

لەگەڵ سڕینەوەی نەخشەی هەر لیوارو کەنارێکا،

لەگەڵ دڕاندنی نامەی پیرۆزی هەر دڵدارێکا،

هەناسەیەکی حەسرەتناك هەڵئەکێشێ.

(ئەم چوار وێنەیەی سەرەوە، پاش ئەوەی یەك لە دوای یەك نیشان ئەدرێن، دوایش تا تەواو بوونی خەیاڵەکە بە مۆنتاژی ئەمێننەوە.)

ئەو پیاوماقوڵە جەربەزەو

سەرو سیما بە هەیبەتە،

لەو وڵاتە غەریبەشدا

داڵغەی هەر لای کوردستانە.

هەر چاوەڕێی

هەڵمەتێکی شێرانەی - عبدولڕحمان - ە

**لەقتەی مام ناوەندی:**

(چاوی کامیرا ئەچێتە سەر ترۆپکی ئاسنگەران و بە هێواشی دێتە خوارەوە تاسەر گۆڕستانەکە.)

نواڵ بە زێواری خۆیا

چاوی لە زێدی هەزاران مەم و زینە

چاوی لە مێرگی قرچۆک و ڕۆی سوتاوو
شاری کوشتن و بڕینە.
گوڵ ئەبینێ..
ژاکاوی دەستی ناحەزانە.
دڵ ئەبینێ..
دیل و گوشراو. پەست و ڕەنجو. پڕ لە ژانە.
چاوی لە ژوانە ئەسڕێ،
گڕ لەنامە بەر ئەبێت و
بۆ کرۆزی ئاوریشمی ووشە هەڵئەچێ.

***

ڕەومز خەمی چەندین چەرخی. لە ڕوو دیارە
لا پاڵ شانی لەسەر شانی
لە دوکەڵا ڕەش داگەڕاین نسارە.
دەومن بەرەگی ڕەشەودەما ئەکاو
بە بەرۆکی نوانەوە
نەخشەی پەنجەی تاوێن دیارە.

***

پێدەشت وەك گوڵ
تەرمی پێشمەرگەی لێ ئەدرێ.
وەیشومە و تۆفی ئەم وەرزە پڕ نەهاتەی
لەسەر سنگی هەڵگرتووەو
لەگەڵ خەمە سەوزەکانی ناخیا ئەدوێ.
چەند گوڵێکی هەڵپڕوکاو
عاشقبەندی سەر بەرۆکن و
موژدە ئەگرن.
موژدە ئەگرن.. بۆ پێشوازی بوکی هەتاو.

***

خەڵکێکی زۆر.. مات و دڵتەنگ.
پەست و بێ دەنگ راوەستاون.
لە گمی مەنگی کەوتنی ئەو کۆستەدا
سەرا پا نیوە خنکاون.
لەشانەی چاو.. هەنگوینی رێز
ئەبارێنن. بەسەر تەرما
هەناسەی سارد هەڵئەکێشن،
بەسەر کوانوی دڵی گەرما.

هەندیَ دەوری تەرمیان داوەو

لەسەر روومەت میسکی فرمیَسك هەڵئەبەستن.

هەندیَ خەریکی گۆریچەو

هەندیَکیشیان پاچو خاکەناز بەدەستن.

ئەرسەلانیش.. وەکو مۆم کز کز ئەسوتیَ

رابوردووی تاڵ. پڕ کارەساتی جەرگ بڕ.

وەك فلیمیَکی تراژیدی

بە پیَش چاویان دیَتو ئەچیَ.

(شەهیدبوونی مامو گرتنی باوکی لەشارو برینداربوونی لە دەرەوەدا لەگەڵ چەندجار دەربەدەربوونو دووجار برینداربوونی شەهیدو ئەوساتەش، کە شەهید ئەبیَ)

گوللە ئەهات.. گوللە ئەچوو

تا یەکیَکیان هەڵۆی پیَکاو سەری سنگی بە خویَن سور بوو.

(لەسەر تەرمەکە یەك لەدوای یەك نیشان ئەدریَن.)

گۆڕ تەواو بوو..

مەوجی سوریان، لەسەر تابوتەکە لادا

قەدو باڵا پلینگیەکەی بەدەرکەوتو، لە گۆڕ نرا.

***

کەڵە پیاوێ کەوتە دوان:
عەتری چەندین رستەی سووری
بەسەر گۆڕو سیمای خەڵکەکەدا پژان.
بەرگی سەوزی ستایشی. بە باڵای پیرۆزی بڕی و
ئەمجا ووتی!
بژی شەهید - عبدالرحمن -.

# ناوی هەندێ لەو کەسانەی هەمیشە لە بیرەوەریمدا دەمێننەوە

## خوالێخۆشبوو مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد:

ئەم مرۆڤە تێکۆشەرە، کە من لە ساڵی ١٦٣وە لە نزیکەوە ناسیم زیاتر لە (٧٠) ساڵ خەباتی بۆ بەرژەوەندیی خەڵکی کوردستان کرد، هەموو کەس دەزانێ چەندە لێهاتوو زاناو دانا بوو. ئەم نەمرە هەموو ژیانی خۆی بۆ خەبات لە پێناو رزگاریی کوردستان بوو.

مامۆستا برایم ئەحمەد رابەرو سیاستمەدارو شاعیرو نووسەرو گەورەپیاوی کورد بوو. جگە لەوە پیاوێکی قسە خۆش‌و رووخۆش‌و بە توانا بوو. لە هەموو بوارەکانی کارکردندا مامۆستای کوردایەتی بوو. هەمیشە لایەنگری ئەو کەسانە بوو، کە خاوەنی کردەوەی باش بوون‌و دژی دزو جەردەو داوێنپیسان بوو.

لە یادمە جارێ لەگەڵ مامۆستا (ئیبراهیم) بووم، لە (مەلا عەبدوڵڵا ئیسماعیل) تووڕە بوو، گوتی: "تۆ پیاوێکی سەیری، ئەگەر بتەوێ لایەنگیری یەکێ بیت، ئەوەندەی بۆ شل دەکەی تا بە هەڵەدا بچێ‌و ئەگەر بتەوێ لە دژی قسە بکەی، ئەوەندەی توند دەکەی هەتا

بیخنکێنی. من پێم خۆشە لە نێوان ئەم دوو ئاکارەدا مام ناوەندی بی."

ئەویش بە دڵی فرەوانەوە وەڵامی دایەوەو گوتی:

"بەڕێز، ئەوەی باسیان کردوە رەنگە وا نەبێ، بەڵام هەموو قسەکانی جەنابتم قەبوڵە."

هەروەها هەندێ جار دەچووم بەسەر قسەکانیدا، کە لەگەڵ شەهیدی قارەمانی گەلەکەمان کاك (عومەر دەبابە)دا دەبوو. لە دانیشتنەکاندا لە نێوان خۆیاندا باسی هەندێ شتی جۆراوجۆریان دەکردو هەوڵیان دەدا بۆ چارەسەرکردنی هەندێ کێشە، بەڵام نەیاندەویست لەم لاولادا باسی بکەن.

هەندی جار هەڤاڵی بەڕێز (مام جەلال)و شەهیدی نەمر کاك (عەلی عەسکەری)یش لە دانیشتنەکاندا ئامادە دەبوون. ئەوانیش وەکو برایەکی گەورەو سەرکردەی خۆیان گوێیان لێدەگرت و هەوڵیشیان دەدا چارەسەرێکی گونجاو بۆ کێشەکان بدۆزنەوە.

لە بیرمە مامۆستا (ئیبراهیم)و برادەران قسەیان لەسەر ئەوە دەکرد، کە (محەمەد سەید عەلی) هەندێ شت دەکا بە ناوی کاك (عەلی عەسکەری)یەوە، یان شێخایەتیەوە. بۆ نموونە، دەیانگوت لە ساڵی ١٩٦٧ کۆمەڵێ دەسگیرکران لە نێو (سلێمانی) بە تەقەمەنی‌یەوە. یەکێ لەوانە (شێرکۆی شێخ عەلی سەرگەڵویی) بوو. وایان باس دەکرد، کە ئەوانە

خزمی شەهیدی نەمر کاك (عەلی عەسکەری)ن. بیرمە کاك (عەلی عەسکەری) گوتی:

"ئەمانە هەموویان لە حورمەتی من کەم دەکەنەوە، من پێش ئەوەی شێخ بم کوردم، ئەمڕۆش ئەندامی سەرکردایەتی بزووتنەوەیەکی کوردیمو بەرژەوەندیی خەڵکی کوردستان لەسەرو بەرژەوەندیی شێخایەتیو کەسایەتییەوەیە لەلام.

بیرمە رۆژێکیان لە ساڵی ١٩٦٨، ئەو کاتە سەردەمی (عەبدەلڕەحمان عارف) بوو، لە بارەگاکەی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد لە شەقامی فەلەستین لە بەغدا دانیشتبووم. مامۆستا عەبدولڕەحمان ی زەبیحی یش لای دانیشتبوو. گوێم لێبوو (ئەحمەد حەسەن بەکر) تەلەفونی بۆ کرد. بەڵام ئەو گوتی: "بڵێن لێرە نییە." پاشان پێی گوتین: "دەزاننبۆچی تەلەفون دەکا؟ دەیەوێ بەشداری لەو خۆپیشاندانانەدا بکەین، کە سبەینێ بەعسیەکان دژی عەبدولڕەحمان عارف دەیکەن. من بەکرو بەعسیەکان چاك دەناسم، درۆزنو فێڵبازن. پێشتر کە لەسر حوکوم بوون هیچیان بۆ نەکردینو کوردیان تووشی کارەسات کرد. ئێستاش دەیانەوێ کورد بگلێننە دژایەتیەوە لەگەڵ عەبدولڕەحمان عارف.

دیارە چەند رۆژێ دوای ئەو تەلەفونە بەعسیەکان ئینقلابی (١٧ی تەموز)یان کرد.

## هەڤاڵی تێکۆشەر مام جەلال:

ئەم سەرکردە لێهاتووە من لە ساڵی ١٩٦١ەوە لە نزیکەوە ناسیومە، هەموو ژیانی خۆی بۆ کورد بە خەرجداوەو بۆ تەنها ساتێ لە کاروانی خەباتو تێکۆشان لە پێناو رزگاریی میللەتەکەیدا ماندوونەناسانە بە درێژایی خەباتی چەند ساڵەی بۆ کوردو کوردستان وچان نەداوە. هەمیشە ئەم تێکۆشەرە بە ئاگاو هۆشیارو ئامادەبووە لە ژیانی سیاسیی خەباتیدا، کە رووبەڕووی هەموو گرفتەکان بۆتەوەو سەرکردەیەکی کارامەش بووە لە بوارەکانی سیاسیو سەربازیو کارگێڕیو کۆمەڵایەتیدا. سەرەڕای ئەو هەموو رەوشە نالەبارەی، کە رووبەڕووی میللەتی ئێمە بۆتەوە، ئەم سەرکردەیە توانیویەتی گەلی کورد بگەیەنێتە قۆناغێکی پێشکەوتوو.

مام جەلال پیاوێکی دەست پاکو داوێن پاکە. لە رۆژی لێقەوماندا خۆڕاگرە. پیاوێکی زاناو نوسەرو زمانزانە. وەك باری عەسکەریش هەموو مەرجێکی ئازایەتی تیدایەو لەبارەی سیاسیەوە زۆر بەتوانایە.

بەڵام لاکەی تری کەهات بەسەریا زۆر تووڕەیە، و بەرامبەر بە خەڵکە هیلاکەکە وەك پێویست گوێیان لێ ناگرێ، و هەندێ جار مەجالی خەڵکی بێ تواناو ناشایستە دەداتو لە ناو خەڵکدا رێزیان بۆ دادەنێت ئەمەش بۆتە هۆی نیگەرانی خەڵك.

## عومەر مستەفا دەبابە (كاكی كاكان)

له پێشدا له ساڵەكانی ١٩٥٥ – ١٩٥٦ له دوورەوه ناسیم. ئەو ساڵه بوو، كه تازه دەرچووی كۆلێژی یاسا بوو، پیاوێكی تێكۆشەرو خاكیو لەخۆبوردووو نیشتمانپەروەر بوو.

بیرمه زەوییەكی له (تۆفیق قەزاز) له (سەراوی سوبحان ئاغا)دا به كرێ گرتبوو. له گوندی (سۆیلەمیش)ەوه له لای (كۆیه)وه چەند جوتیارێكی هێنابوو بۆ كاری كشتوكاڵیو وەرزێری، بۆ ئەوەی توتنو پەمو له ناوچەكەدا بچێنن. له كاتی پێویستیشدا كاری دادوەریی دەكرد بۆ جوتیارەكان دەكرد به بێ بەرامبەر. یەكێ لەو جوتیارانەی ناوی (سمایل) بوو. كاكی كاكان ئەو كاته جێبێكی ئەمریكیی مۆدێل ٥١ ی پێبوو لێیدەخوڕی. زۆر جار هاتووچۆی هەڵەبجەی دەكرد. هەرچەند دەمبینی چەند جوتیارێكی لەگەڵدا بوو، جلی كوردیی لەبەر دەكردو دەمانچەو تفەنگێ برنەوی كولی پێبوو. هەڵبەته ئەو دەمه خەڵكی دەیانتوانی به مۆڵەتی رەسمیی دەوڵەت چەك هەڵبگرن.

**پیاوێكی لێهاتووو قۆز بوو، بەڕاستی پیاوێكی هەڵكەوتووو قارەمان بوو، ئێمه زۆرمان پێخۆش بوو، كه لێی نزیك بینەوەو بیناسین، خەڵكی زۆر به باشه باسیان دەكرد، كه زۆر نیشتمانپەروەره. خەڵكی هەڵەبجەو شارەزوور زۆر رێزیان لێدەگرت. ئەوانەی كه دەیانناسی باسی ئەوەیان دەكرد ئەگەر جوتیارێ غەدری لێ بكرێ به بێ موقابل دیفاعی لێدەكا.**

ئەو کاتەش خەڵکی پرسیاریان دەکرد چۆن دەتوانێ بە ئاشکرا دەمانچەو تفەنگ هەڵگرێ؟ دەیانگوت بە ئیجازەی حکومەت. بەراستی لە نێو خەڵکی هەڵەبجەدا هێندە خۆشەویست بوو، کە بهاتایە، خەڵکی دەچوونە سەر جادە بۆ تەماشاکردنی.

پاشان، ئەوە بوو لە ساڵەکانی دوای (شۆڕشی ١٤ گەلاوێژ) لە سەرکردایەتیی (پ.د.ك) ئاشکرا بوو، کە ئەو کاتە لە شۆڕشی ئەیلوول دا ئەو ئەندامی (م.س) بوو. لە ساڵی ١٩٦٣دا فەرماندەی هێز بوو. ئێمەش وردە وردە لە نزیکەوە ئاشنای بووین. ئەو کاتە من زیاتر ناسیمو تێکەڵاویەکی باشم لەگەڵی هەبوو. لە ساڵەکانی ٦٦ و ٦٧ دا چەند جەولەیەکمان بەیەکەوە کرد بۆ ناوچەی سورداشو قەرەداغ.

بەڕاستی ئەوەندەی من ناسیومە بە درێژایی ئەم شۆڕشە هەر خاوەنی هەڵوێست بووە بەرامبەر بە خزمەتکردنی خەڵکی کوردستان، بێ بیرکردنەوە لە بەرژەوەندیی ماددیو تایبەتی خۆی. ئەوەندەی منیش بزانم خاوەنی (٥٠) مەتر زەویی نەبوو، چ لە کوردستانو چ لە دەرەوەی کوردستان. ئەوە بوو، دوای هەرەس بە ناچاری چووە (لەندەن) بۆ چارەسەری نەخۆشی، بەڵام هەر بەردەوام بوو لە خەباتو تێکۆشان بۆ کوردو کوردستان، بگرە لە ئەوروپا کارو چالاکییە شۆڕشگێڕییەکانی زیادی کرد. هەتا ساڵی ١٩٩١، دوای راپەڕین، گەڕایەوە بۆ کوردستانو ئامادەیی خۆی پیشاندا، کە هەرچیی پێ بسپێرن بیکا. بەڕێز (مام

جەلال) ناردی بۆ سوریا بۆ کاری گرنگ، ئەمە جگە لەوەی وەك نوێنەر نێردرا بۆ چەند شوێنێکی دیکە، هەر چەندە تەندروستی تەواو نەبوو، پێویستی بە چارەسەرو پشوو هەبوو، بەڵام کۆڵی نەدەدا لە کارو خەبات لە پێناوی خەڵکی کوردستان. ئەوە بوو، لە کۆنگرەی یەکەمی (ی.ن.ك)، لە بەهاری ۱۹۹۲دا، کە لە گەرمەی ئیش‌و کارەکانی کۆنگرەدا بوو گیانی سپاردو گەیشتە ریزی شەهیدانی کوردستان.

ساڵی ۱۹۷٦ خوالێخۆشبوو (عومەر دەبابە)، کە جێگری بەڕێوەبەری دارستان بوو لە (رومادی). منیش لەگەڵیدا لەوێ بووم. پاشان من گەڕامەوە بۆ سلێمانی‌و دوای یەك مانگ مانەوەم، دووبارە گەڕامەوە بۆ (رومادی) بۆ لای کاك (عومەر دەبابە)و رەوشی (سلێمانی‌و هەڵەبجە)و دەوروبەریم بۆ گێڕایەوە. ئەویش باسی ئەوەی بۆ کردم، کە حکومەتی عیراق داوایان لێکردووە بچێ چاوی بە خوالێخۆشبوو مامۆستا (ئیبراهیم ئەحمەد)و بەڕێز (مام جەلال) بکەوێ.

کاك (عومەر) بۆی باس کردم، گوتی: "هەرچەند من پێم وتوون ئەوان بەقسەی من ناکەن، بەڵام هەر ناچاریان کردووم بڕۆم."

## حیلمی عەلی شەریف:

ساڵی ١٩٦١ کاك حیلمی عەلی شەریف م ناسی. پیاوێکی تێکۆشەرو ئازاو نووسەرو نیشتمانپەروەر بوو. بیرمە ساڵی ١٩٦٢ بە نهێنی لە ناوچەی سەرتەكو بەمۆوە هاتە هەڵەبجەو چووە ماڵی (غەفور شەریف). دانیشتینو گفتوگۆمان کردو ڕێککەوتین لەسەر ئەوەی ڕۆژی دوایی بێتە زەڵەکیو لەگەڵ هەڤالانی خوالێخۆشبوو شێخ حەمەئەمینو شێخ سەعیدی موفتی لەسەر بارودۆخی ناوچەکە قسە بکەین. بۆ ڕۆژی دوایی کاك حیلمی هاتە (زەڵەکی)[4]. چەند کەسێکی لەگەڵدا بوو. لەوانە (مەحمود بەگی وەسمان بەگی شێرە بەیانی)، خەڵکی لای سەرتەكو بەمۆ بوو. هەروەها (عەبدولڕەحمانی زەلکە)و (سابیری کوێخا محەمەدی شمشێر کوڵ)و (کاکەی میللەت)و (حسێنی حاجی محەمەد)و (حسێنی غولام). دووشەو لەوێدا ماینەوە. ڕۆژی دوایی لە شەڕی زەڵەکی پێکەوە بووین. کاك حیلمی لەو شەڕەدا بە سەختی برندار بوو. بە ڕاستی کاك حیلمی پیاوێکی بە هیمەتو ئازاو لێهاتوو بوو.

لە بەهاری ساڵی ١٩٦٤، لە سەرەتای شەڕی براکوژیدا لەگەڵ کاك حیلمی بووم لە ناوچەی سەرتەكو بەمۆ لە نزیی هۆرێنو شێخان. جارێکیتریش بریندار بوو.

---

[4] دێی زەڵەکی پێکهاتبوو لە دوو ماڵو دوو باخ، کەوتبووە نێوان عەبابەیلیو دۆڵەمەڕ.

ئەو کاتانەی لە بەغدا دەژیا، ئەوەندەی من بزانم چەند جارێ بە نهێنی هاتەوە سلێمانیو چاوی بە هەڤاڵ مام جەلال کەوت. بڕیاری دابوو بگەڕێتەوە کوردستانی ئازاد، بەڵام مردن بواری نەدا. کە گەڕایەوە بەغدا کۆچی دوایی کرد.

## مامۆستا عەبدولڕەحمانی زەبیحی (مولەها):

تێکۆشەرو سیاسەتمەدارو خۆشەویستی خەڵکی کوردستانی ئێرانو عیراق مامۆستای نەمر (عەبدورەحمان زەبیحی)، هەر چۆنێ باسی بکەی رەنگە هێشتا کەم بێ. ئەم پیاوە زۆر تێکۆشەرو خەمخۆری خەڵکی کوردستان بوو، بێ ئەوەی هیچ سەرمایەیەکی هەبێ، یان بیر لە هیچ شتێ بکاتەوە، بۆ خۆشیو خۆشگوزەرانیو ژیانی تایبەتی خۆی. ئەم پیاوە ناودارە نووسەرێکی ناسراوی کورد بوو، چەندەها کتێبو نووسینو شاکاری فەرهەنگیو زمانی لەپاش بەجێماوە.

لە کۆماری مەهاباددا بەشدار بووە. بەڵام ئەوکاتەی ئەندامی مەکتەبی سیاسی بوو لە پارتی، من لە مانگی دوانزەی ساڵی ١٩٦٦دا ناسیم.هەروەها لێپرسراوی داراییش بوو. دینارێکی زیادەی بۆ کەس سەرف نەدەکرد، تەنانەت بۆ خۆیشی. ئەو جلو بەرگەی لەبەریدا بوو، زۆر شڕ بوو، دەیشتو لەبەریدەکردەوە. لەبەر ئەوە مەکتەبی سیاسی رێگەیان پێدا دەستێ جلی نوێ بکڕێ لە پارەی حیزب. ئەویش چوو لە

فەردە دەستێکی کڕی‌و لەبەری کرد. شوێنی دیاری نەبوو، کەس نەیدەزانی لەکوێ دەژی. خۆی زۆر دەپاراست. دوای یانزەی ئازار، ئێمە وەك (پارتی شۆڕشگێڕانی کوردستان) چووینە بارەگای بارزانی‌و تەنها ئەو نەهات. هەرچەندە رەحمەتی بارزانی داوایکرد، بەلام ئەو نەچوو. هەر پێی خۆش نەبوو بچێ لەوێ بمێنێتەوە. چەندین جار برادەران پێیان دەگوت بۆ ئەو مەبەستە. هەرچەند ئەم پیاوە دژی رێکەوتنەکە نەبوو، بەڵکو زۆری پێخۆش بووو هانی هەموو لایەکی دەدا، کە دەبێ هەوڵ بدەین رێك بکەوین، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە دووپاتی دەکردەوەو دەیگوت:

"من باوەڕم بەوە نی‌یە حکومەتی عیراق هیچ بۆ گەلی کورد بکا، بەلام تا چەندە رێك‌و تەبابین لە نێوانی خۆماندا، ئەوا کاریگەریی تەواومان دەبێ لەسەر دوژمن."

لەم بارەیەوە زۆر قسەی باشی دەکرد. ئەوە بوو ئاشتبوونەوەکەی نێوان ئێمەو پارتی رۆڵێکی باشی هەبوو بۆ نێو خۆمان‌و تێکەڵبوونەوەمان.

ساڵی ١٩٧٦ رژێمی بەغدا داوایان لێکرد بە نهێنی بچێتەوە بۆ ئێران‌و حزبێکی کوردی دروست بکاو بە یارمەتی‌و پشتیوانیی رژێمی بەغدا شۆڕشێکی چەکداری دژی رژێمی حەمە رەزا شا بەرپا بکا. ئەویش پەیوەندیی کرد بە مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدو مام جەلال دەوەو رەزامەندیەی وەرگرتن. دوای گەڕانەوەی مام جەلال لە سوریاوە بۆ

کوردستان لە ساڵی ١٩٧٧، مامۆستا زەبیحی دەست بەکار بوو بۆ ئەو مەبەستەو پەیوەندیی بە حامیدی تاهیر بەگو نوری غەفار بەگو مستەفا یەناخیو حەمە تاهیر بەگ ەە کرد. ئەوەی من ئاگادارم، مامۆستا زەبیحی خۆی بۆی گێڕامەوە، کە دوو جار لەو چەکو تەقەمەنییانەی لە رژێمی بەغدای وەرگرتبوو، نیوەی دابوو بە (ی.ن.ك).

لە ساڵی ١٩٧٦و ١٩٧٧، کە دەهاتە سلێمانی سەردانی دەکردم.

هەروەها دەمەوێ ئەم شاهیدیەش بۆ ئەم تێکۆشەرو رووناکبیرە بدەم، کە لە شەڕی (ئێران ـ عیراق)دا حکومەتی عیراق فشاری لەسەر دانابوو بۆ ئەوەی هەوڵ بدا لە کوردەکانی (ئێرانو عیراق) هێزێ دروست بکا بە ناوی کوردستانی ئێرانەوە، ئەویش پێشنیازو داواکەی دواخستبوو بۆ ئەوەی بۆچوونو باری سەرنجی خوالێخۆشبوو مامۆستا (ئیبراهیم ئەحمەد)و کاك (عومەر دەبابە)و بەڕێز (مام جەلال) وەربگرێ، بۆ ئەوەی بزانێ، کە ئەوان رایان چییە لەسەر ئەم داوایەی حکومەتی عیراق؟ من ئاگام لێیە ئەمانیش پێیان راگەیاندبوو، کە زۆر چاکەو بەڵکو لەو بوارەشدا بتوانی هەندێ لە مافەکانی خەڵکی کوردستان جێبەجێ بکەین، هەروەها بتوانین کوردی ئێرانو عیراق پێکەوە رێکبخەین، ئێمەش لەمەدا پشتگیریت لێدەکەین. وەکو شۆڕشی نوێ، مامۆستای نەمر (عەبدوڕەحمان زەبیحی) جارێکیتر لەگەڵ بەرپرسانی

حکومەتی عیراقدا چاویان کەوتبوو بەیەك، هەندێ مەرج و پێش وەختی بۆ دانان، کە بەو شێوەیە کاریان لەگەڵدا دەکا، ئەوانیش وەڵامیان دابووەوە، کە هەموو ئەو شتانەمان قبوڵە. مامۆستای نەمر دەستی کرد بە ئیش و کارکردن لەگەڵیانداو کۆمەڵێ پێویستیشیان بۆ دابین کرد، پاشان مامۆستا گەشتێکی کرد بۆ ناو ئێران و لەگەڵ چەند کەسێکدا لە دیوی ئێران وەك (حامیدی حمە تایەر بەگ)و مستەفا ئێناخی)و چەند کەسێکیتر هەندێ رێکخستن و (تشکیلات)ی کرد لە ناو کوردەکانی ئێراندا بە نهێنی، چەند شانەیەکی چەکداری دروست کرد بۆ ئەوەی پەیوەندی بکەن بە خەڵکە چاك و جوامێرەکانەوە. پاشان مامۆستای نەمر بۆ کوردستانی عیراق گەڕایەوە.

پیاوێ بەناوی (مەلا عەلی)ەوە هەبوو، ئێرانی بوو، چاودێر بوو لە دەزگای (رێگاو پرد)، هاتە لام ئەو کاتە لە نوسینگەکەی خۆمدا من خەریکی (بەڵێندەری) بووم، پێی گوتم:

"پێم خۆشە بە تەنها بتبینم هەندێ قسەم هەیە لەگەڵتدا."

منیش پێم خۆش بوو، دوای نیو کاتژمێر چووینەوە بۆ ماڵی خۆمان و دانیشتین.

گوتی: "مامۆستا (عەبدوڕەحمان زەبێحی) لە ماڵی ئێمەیەو دەڵێ پێم خۆشە چاوم بە کاکە حەمە بکەوێ." منیش پێم گوت: "بێم بۆ ماڵی ئێوە، یان بنێرم بەدوایدا بێ بۆ ئێرە؟" لەوە دەچوو مەلا عەلی بترسێ

لەوەی، کە من بچم بۆ ماڵی ئەوان. منیش (عەبدوڕەحمان)ی کوڕم نارد بە دوایداو هات بۆ ماڵی خۆمان. پاشان جێگەیەکی ئەمینمان بۆ دابین کرد، چونکە لەوە دەچوو ئەویش پێی خۆش نەبێ کەس بیبینێو بزانێ هاتووچۆی من دەکا.

مامۆستا هات بۆ ماڵی ئێمەو زۆر ڕێزو ئیحتراممان لێگرت.

گوتی: "با کەس نەزانێ، کە هاتووم بۆ ئێرە، چونکە بۆ منو تۆ باش نییە." منیش ئەوکاتە لەژێرچاودێریی ئاسایشدا بووم، بەڵام ئەو زۆر گرنگیی بە پاراستنی خۆیو دۆستەکانی دەدا.

لەگەڵ مامۆستای خوالێخۆشبوو زۆر قسەمان کرد، باسی ئەوەی بۆ کردم کەوا ئەو پەیوەندیی بەهێزی لەگەڵ بەڕێز (مام جەلال)دا هەیەو بە ڕەزامەندیی ئەوو برادەران ئەم کارەی کردوەو بۆ بەرژەوەندیی خەڵکی کوردستان ئەمەی کردوە. زۆر شتیتریشی بۆ باس کردم، کە لە دیوی کوردستانی ئێران سەرگەرمە پێوەی.

پێشی گوتم:

"بەیانی زوو دەڕۆم بۆ (بەغدا)و بە (عەبدوڕەحمان)ی کوڕت بڵێ پێش ئەوەی دنیا ڕووناك بێتەوە بمگەیەنێتە گەراجی (بەغدا)."

منیش (عەبدوڕحمان)م ئاگادار کرد کاتژمێر (٥)ی بەیانی مامۆستا ببا بۆ گەراج.

خوا حافیزیمان لەیەك کردو لەدوایشدا گوتی:

"با ئاگامان لەیەك بێ."

منیش پێم گوت:

"زۆرم پێخۆشە هەر کارێکیش بە من بکرێ ئامادەم بۆ ئەنجامدانی."

(عەبدوڕەحمان) بردی بۆ گەراجی (بەغدا)و پێی گوتبوو نەچیتە ناو گەراج خۆی بەپێ دەچێ بۆ ئەوەی کەس (عەبدولڕەحمان) نەبینێ.

(عەبدوڕەحمان) گەڕایەوەو بۆی باس کردم، گوتی:

"لە کۆڵانێکدا دامبەزاند لە نزیك گەراجەکەوەو خۆی بە پێ ڕۆیشت."

دوای ماوەیەك (مەلا عەلی)، کە دۆستێکی نزیکی خۆی بوو، لە شۆڕشی مەهابادیشدا ڕۆڵی گرنگی هەبوو، ئاشنای مامۆستا (زەبیحی) بوو، پێی گوتم: "مامۆستا هاتۆتەوەو ڕۆیشتووە بەرەو ئێران."

دوای ماوەیەکیتر هاتەوە دیمو باسی بۆ کردم، گوتی:

"لە دیوی ئێران خەریکی کاری باشم."

هەروەها باسی (مام جەلال) یشی بۆ کردم، حاڵو گوزەرانیان چۆنە، گوتی: "ئێستا من یارمەتیان دەدەم بە چەكو کۆمەڵێ زانیاریو پێداویستیو زۆر شتیتر، مامۆستا لە ئێران گەڕایەوەو ڕۆیشتەوە بۆ (بەغدا)، ئەم جارەش، کە گەڕایەوە چاوم پێکەوتو پێم گوت:

"ئامادەم بۆ کوێ بچیت بە ئۆتۆمبیل بتگەیەنم."

بەڵام ئەو پیاوە زۆر خاوەن ئەزموونو لێهاتوو بوو، پێی گوتم:

"نامەوێ دووچاری گرفتو كێشەتان بكەم، بەڵام لەكاتی پێویستدا، ئەگەر ئیشم هەبوو لە ڕێی (مەلا عەلی)ەوە ئاگادارتان دەكەم."

زۆر بەداخەوە ئیتر چاوم پێی نەكەوتەوەو لە ناویان برد، سەد رەحمەت لە گۆڕەكەی. ئەوەندەی من مامۆستا (عەبدوڕەحمان زەبیحی)م ناسیبێ، یەكێ بوو لە دەستەی بەڕێوەبەرایەتی شۆڕشی مەهابادو خەڵكی شاری مەهاباد بوو. لە بنەماڵەیەكی تێكۆشەرو دیار بوو، هەروەها پیاوێكی زۆر جوامێرو كورد پەروەرو زاناو رۆشنبیرو خەمخۆری خەڵكی كوردستان بوو، بەبێ ئەوەی بیر بكاتەوە لە سەروەتو سامان پلەو پایە، هەروەها هیچ گرنگییەكی بە پۆستی حیزبیو بەرژەوەندیی تایبەتی خۆی نەدەدا.

## خالیدی حاجی فەرەج:

كادرێكی دڵسۆزو لێوەشاوەی كوردایەتی بوو، نەك هەر لە ریزی رێكخستن، بەڵكو لەنێو پێشمەرگەشدا دەستێكی باڵای هەبوو بۆ بەرپەرچدانەوەی دوژمنانی رێبازی كوردایەتی. هەروەها هەموو خێزانەكەیان تووشی ئازارو ئەشكەنجەی زۆر بوون. چەندین شەهیدیان هەیە، بەڵام بەداخەوە ئەویش بە فیتی ناپاكانی بزووتنەوەی كوردایەتی شەهید كرا.

## کاك شازاد سائب:

لە ساڵی ١٩٦٦ەوە ناسیومە. ئەم پیاوە تێکۆشەرو بەتواناو لێهاتوو بووەو هەر لە تەمەنی لاویدا کراوەتە لێپرسراوی خوێندکاران. ئەو کاتە، کە لە زانکۆی (مستنصریە) بوو لە (بەغدا) زۆر باسی ئەوەی بۆ دەکردم، کە زوو یاسا تەواو بکاو بێتە دەرەوە ببێ بە پێشمەرگە. ئەم تێکۆشەرە زۆر قسە خۆش‌و زۆر لێهاتوو بوو، جێگەی رەزامەندیی خەڵکی کوردستان بوو. تازە کۆلێژی یاسای تەواو کردبوو کرا بە سەرنووسەری گۆڤاری رزگاری، لەگەڵ ئەوەشدا هەر دەرفەتێکی هەبووایە یارمەتیی خەڵکی دەدا بۆ ئیش‌و کاری یاسایی بەبێ بەرامبەر. لە دوای (١١)ی ئازاری ١٩٧٠ یەکەم کەس بوو لەگەڵ هەڤاڵی بەڕێز (مام جەلال)دا چوون بۆ وتووێژ بۆ لای جەنابی (مەلا مستەفا) بۆ کۆتایی هێنان بە کێشەی ئێمە لەگەڵ پارتیدا. زۆر لایەنگری ئاشتی‌و یەکبوون بوو. دوای هەرەس، هەمووومان گەڕاینەوە بۆ شاری (سلێمانی). ئەم پیاوە دوو ژووری گرتبوو لە بیناکەی (تۆفیق قەزاز)دا لەگەڵ برای بەڕێز کاك (حەمید بڵباس)، کە ئەویش پیاوێکی تێکۆشەرو ماندوونەناس بوو، هەموو کاتەکانی تەرخان کردبوو بۆ خزمەتکردنی خەڵکی کوردستان. لەگەڵ ئەوەشدا ئیش‌و کاری رێکخستنیان لە (سلێمانی) بەڕێوە دەبرد، ئێمەش هاتووچۆمان دەکردن. کابرایەکی کەڕولاڵی دانابوو بە فەڕاشی خۆی لە بەر دەرگاو ناوی (سەید) بوو. ئەگەر خەڵکی وەکو ئێمەمانان

بچووینایە بۆ لای کاك (شازاد)، یان کاك (حەمید)، بە ئاماژە دەیگوت لەم دەرگایەوە بچنە ژوورەوە، چونکە میوانی هەیە بۆ ئەوەی نەتانبینن.

دوای بەربوونم لە زیندان لەساڵی ١٩٨٢ دا چوومە دەرەوەو ئیتر من و کاك (شازاد) پەیوەندیمان بەیەکەوە نەما. دوای ئەوەی لە ١٩٨٥/٥/٢٥ بریندار بووم، لە ١٩٨٥/١١/٢٥ گەیشتمە سویدو چەند جارێ پەیوەندیی پێوە کردم، بۆ هەواڵ پرسینم. ئەو کاتە ئەو لە هۆڵەندا بوو. زۆر خەفەتی دەخوارد بەو کارەساتەی بەسەرمدا هاتبوو بە لەدەست دانی قاچی راستم‌و شەهید بوونی (عەبدولرەحمان)ی کوڕم. کاتێ کە لە نەخۆشخانە دەرچووم، داوای لێکردم بچم سەری لێبدەم لە هۆڵەندا، چونکە ئەو کاتە ئەو ئیقامەی وەرنەگرتبوو، نەیدەتوانی بێت بۆ لای من. منیش لە مانگی ١٩٨٥/٧ لەگەڵ برای بەڕێزم کاك (مەحمودی مەلا عزت) چووین بۆ لای بۆ هۆڵەندا، لەوێ دوکانی کەبابخانەی هەبوو، هەفتەیەك لەوێ ماینەوەو سەردانی چەند برادەرێکی تریشمان کرد. ئەم پیاوە نیشتمان پەروەرە سیفەتی وابوو زۆر چاودێری هاوڕێکانی خۆی دەکرد.

هەروەها لە دوای راپەڕین لە ساڵی ١٩٩٢ وەك نوێنەری یەکێتی لە ئەستەمبوڵ دەست بەکار بوو، زۆر کاری باشی دەکردو جێگای دڵخۆشی خەڵکی کوردستان بوو. لە مانگی (٢٠٠١/٤) کرا بە وەزیری کشتوکاڵ.

ئەو هەرچەندە نەیدەویست ببێ بە وەزیر، بەڵام بەهۆی داوای هەڤاڵ (مام جەلال)ەوە قبوڵی کرد. ئەم پیاوە تێکۆشەرە گوێی نەداوەتە دەسەلاتو سەروەتو سامانو هەر باسی ئەوەی دەکرد، کە دەبێ هەموو لایەکمان هەوڵ بدەین بۆ چارەسەری کێشەی خەڵکی کوردستان بە گوێرەی ئەو توانایەی، کە هەمانە. زۆر بەداخەوە رۆژی ۲۰۰۱/٥/۲۱ بەکاری رەسمی لە نێوان (سلێمانی)و (رانیە)دا بە کارەساتی ئۆتۆمبیل خۆیو هاورێکەی شەهیدبوون. سەد رەحمەت لە گۆڕیو خوا لێی خۆشبێ.

## مامۆستا جەمال عبدول:

لە ساڵەکانی ١٩٦٤دا یەکترمان ناسی. ئەم مرۆڤە هەموو سیفەتێکی نیشتمانپەروەریو وەفاو رەوشتی تێدایە بێ ئەوەی بیر لە دەسەلاتو بەرژەوەندیی تایبەتی خۆی بکاتەوە. بەڵکو هەر خەریکی کاری باشو خزمەتکردن بووە بە خەڵکی کوردستان بەبێ جیاوازیی بەرامبەر بە خەڵکە چاکەکە. ئەوەندەی من ئەم پیاوە دەناسم سەروەتو سامانی نییە، بیریشی لەوە نەکردۆتەوە، کە سەروەتو سامان پێکەوە بنێ. وەکو رۆشنبیرێ هەموو کاتەکانی لە پێناوی رزگاری میللەتەکەیدا تەرخانکردووە، بەتایبەتی لە پەروەردەکردنی قوتابیانو بوارەکانی فێرکردنو زانستدا. لە ڕاستیدا قسە زۆرە بیکەین لەسەر ئەم پیاوە

تێکۆشەرەو چەندین پیاوی تر، بەڵام من وا دەزانم ئەم پیاوە زۆر دەوڵەمەندە بە خەباتو تێکۆشانی کوردانەی خۆیو ئەمەش لە هەموو سەرمایەیەك باشترە بۆ پاشەرۆژی خۆیو بنەماڵەکەی.
لە ساڵی ١٩٨٠ لە لایەن رژێمی داگیرکەرەوە، پێکەوە لەگەڵ دکتۆر نەوزاد رەفعەتو چەند تێکۆشەرێکیتر زیندانی کران، کە نموونەی خۆڕاگر بوون. بوو بە یەکەم پارزگار لە سلێمانی لە دوای راپەڕین. لە کارەکەیدا سەرکەوتوو بوو. گەورەترین کاری دامەزراندنەوەی زانکۆی سلێمانی بوو. لە ساڵەکانی ١٩٩٤و ١٩٩٥ لە گەرمەی ململانێی حیزبەکاندا لە سلێمانی، رۆڵێکی هێمنکەرەوەی گرتگی گێڕا. هەموو لایەکیش گوێیان لێدەگرت.

## دکتۆر نەوزاد رەفعەت:

لە ساڵانی پەنجاکانەوە دەیناسم. خەڵکی ناوچەیەکینۆ دەزانم بە بنەماڵە بەرێزنو باوکی ریش سپیی کاکەییەکان بوو. لە سەرەتای ژیانیەوە خەریکی خەبات بووە بۆ گەلەکەیو لە سەرەتاشەوە لە یەکێتیی قوتابییانی کوردستان ەوە دەستی پێکردووە. هەموو خێزانەکەیان لەگەڵ رێبازی کوردایەتی بوونو تا ئێستاش بەردەوامن لەسەر ئەو رێبازە.

## شەهیدی ئەمر عەلی عەسکەری:

بەڕاستی ئەم مرۆڤە قارەمانە، ئەوەندەی من لە نزیکەوە دەمناسی، چ لە شۆڕشی ئەیلوول‌و چ لە شۆڕشی نوێدا، دەمبینی هەر خاوەنی هەڵوێستی نیشتمانپەروەرانە بووە.. لە دوای هەرەسی ١٩٧٥ەوە چەند جارێ یەکترمان دی. ئەو هەر باسی ئەوەی دەکرد، کە هەوڵ بدەین بۆ دروستکردنەوەی هێزێکی چەکدار لە کوردستان‌و بۆ پاراستنی خەڵکی کوردستان. تاکو ساڵی ١٩٧٦ لە رومادی، پێکەوە لەگەڵ برای قارەمان‌و تێکۆشەر کاک (عمر دەبابە)و (دکتۆر خالد)یش، بە ئاگاداریی (فەوزی رەشید نامیق) یەکمان دی‌و پاش چەند دانیشتنێکی نهێنی بڕیاری ئەوەماندا هەموو لایەکمان هەوڵ بدەین بۆ دروست کردنەوەی هێزی پێشمەرگە.

## کەمالی سەلیم بەگ:

پیاوێکی زۆر دڵسۆزو بەوەفاو لێهاتوو بووە. لە ساڵی ١٩٥٩ لە سلێمانی قوتابی بوو، لەم کاتەوە لە قوتابیان لە ڕێکخستن هیچ درێغی نەکردووە لەناو شاردا. ساڵی ١٩٦٣ بوو بە پێشمەرگە. لەگەڵ بەڕێز کاک نەوشیروان فۆاد مەستی هاتن بۆ ناوچەی هەڵەبجەو هەورامان وەکو پێشمەرگە پیاوێکی زۆر ئازاو لێهاتوو ماندونەناس بوو لە شەڕەکانی زەڵم دا لەگەڵمانا بەشداری شەڕی سێ مانگەی چەمی زەڵمی کردووە بۆ

حەفتەیەك گەڕایەوە بۆ بیارە بە ئیجازە ئەوە بوو دوای محاولەیەكی زۆری لیوای ٢٠ بەقیادەی زەعیم صدیق ی تاوانبار لەگەڵ فەوجێكی مقلیو چوارسەد جاشی هەڵەبجە كە لە سید صادق مۆڵیان خواردبوو بە هێزی تۆپو تەیارەو دەبابەو جاش دوای ماوەیەكی درێژ توانیان لە پردی زەڵم بپەڕنەوە بەرەو هەڵەبجە دوای ئەوەی زیانێكی زۆرمان بەدوژمن گەیاند. لەشەڕیكی قارەمانانەدا ناچار بووین بگەڕێینەوە دواوە بەرەو بیارە. هەر ئەو ڕۆژە بۆ بەیانی زوو لیوای ٢٠ بەرێكەوت بەرەو بیارە ئێمەش زۆر هیلاك بووین. تاریكو لێڵی بەیانی بوو لەدێی تاوێرە بووین خەبەریان داینێ كەوا چەند لایتێك دیارەو بەرەو ئێرە دێ. هەرچەندە ئێمە زۆر كەم بوین هێشتا پێلاومان دانەكەندبوو بۆ ئیسراحەت نیو سەعات بوو گەیشتبوینە ئەوێ ڕامان كرد بەرەو زەردەهاڵ بۆ ئەوەی بتوانین بەربەو جەیشە بگرین كە ئەڕوات بەرەو بیارە. زۆر بە پەلەپەلو شپرزەییەوە كەوتینە ڕێ تۆانیمان لەبەر دەمی بیارە – ملەگای چنار ڕێ بەو جەیشە بگرین بە گەشتنی جەیشەكە بۆ ملەگای چنار هەموو دێهاتەكانی دەوروبەری دایە بەر تۆپو كاك كمال سلیم هەندێك پێشمەرگەی خۆی كۆ كردەوە بێن بەرەو شەڕەكە. خۆی لە پێش هەموو یانەوە. پێش ئەوەی بگاتە لای ئێمە، باوكو كوڕێك لەسەنگەردا دانیشتبوون پێشمەرگەی نۆبەدار بوون. خەڵكی دێی ڕێشاو بوون. كاك كەمال بەبەردەمیاندا ڕای

کردبوو، ئەوانیش بەنەشارەزایی تەقەیان لێ کردو وایان زانی بوو عەسکەرە. زۆر بەداخەوە لەوێدا شەهید بوو. بەداخەوە کاك کمال کوڕێکی هەڵکەوتوو نیشتمانپەروەر بوو، من وەکو هاوڕێیەك زۆر تەئسیری تێ کردم لەئەوەڵەوە وامان زانی بەعەمدی شەهید کراوە، بەڵام دوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆر وورد بەمن و کاك نوشیروان، بۆمان دەرکەوت کە بەنەشارەزایی بووە پاشان هەندێك هاتینەوە سەرخۆمان. زۆر بەداخەوە بۆ ئەم برا تێکۆشەرە.

## شێخ لەتیفی شێخ سادق بەرزنجی:

پیاوێکی زۆر تێکۆشەرو بەتوانا بوو، هەموو کاتەکانی خۆی تەرخان کردبوو بۆ بەرژەوەندیی خەڵکی کوردستان. رەوشی ژیانیان زۆر باش بوو، خاوەنی تەکیەبوون لە هەموو شوێنەکاندا، بەڵام بێ ئەوەی بیر لە بەرژەوەندیی خۆی بکاتەوە، لەگەڵ خوالێخۆشبوو (مەلا عەبدوڵڵا ئیسماعیل)دا کاری رێکخستنیان دەکردو زۆر ئیش‌و کاری باشیان بۆ جوتیاران دەکرد. دوای راپەڕین من چاوم پێکەوت لە هەولێر، زۆر دڵخۆش بوو، باسی ئەوەی دەکرد پشت بەخوا هەموو لایەکمان ماندوویمان دەحەسێتەوەو کوردیش رزگاری دەبێ‌و بە ئاواتە مێژوویی‌و نەتەوەییەکانی دەگا. بەڵام بەداخەوە لە دروستبوونی شەڕی نێوخۆدا لە دوای (٣١ی ئاب ١٩٩٦) ماڵ‌و منداڵ‌و سەروەت‌و سامانی

بەجێهێشتو هاتە (سلێمانی). چەند جارێ چاوم پێکەوتەوە. زۆر دلگران بوو بە ئاسەوارەکانی شەڕی ناوخۆ، بەڕاستی پیاوێکی لێبوردووو خاوەن بیروباوەڕێکی بەهێز بوو. لە ئەنجامی نەخۆشیدا لە (سلێمانی) کۆچی دوایی کردو لە سەر راسپاردەی خۆی لە گوندی (هەشتەزینی)ی ناوچەی (سەنگاو) بە خاك سپێردرا، کە جێگەی باوباپیرانی بووە.

## مەحمود مەلا عیززەت:

لە دوای ساڵەکانی ١٩٦٢ بوو بە لێپرسراوی ناوچەی هەڵەبجە، ئەم پیاوە لە ساڵی (١٩٦٣)دوە ناسیومە. لەهاوینی ١٩٦٣دا کۆنفرانسی ناوچەی هەڵەبجە سەرپەرشتی دەکاو کۆبوونەوەکان لە تەوێڵە بوو. کاك (عەلی حەمدی)، کە لێپرسراوی لقی سلێمانی بوو، ئامادە بوو، منیش لەگەڵ (پ.م) بووم.

گوتم: دەچین بۆ تەوێڵە."

گوتی: "بۆ لای کێ؟"

گوتم: "بۆ لای حزب."

ئیتر زۆری پێ خۆش بوو.

کە گەیشتینە شوێنی کۆبوونەوەکە، ئەو هەموو خەڵکەی بینی.

گوتی: "ئەوە چییە؟"

گوتم: "ئا ئەوە حیزبە."

لای زۆر سەیر بوو، بۆیە گوتی: "دە بەخوا من نەمزانیوە حیزب لەئینسان پێکهاتووە. دەمگوت دەبێ داخۆ حیزب چی بێ؟!"

پێش ئەوەش لە یەکێتیی قوتابیاندا رۆڵێکی باڵای هەبووە، ناسراوەو خۆشەویست بوو لەلایەن خەڵکی کوردستانەوە، زۆر ئازاو تێکۆشەر بووە. لە هەر کاتێکدا بچووینایە بۆ سەر رەبایەکان، یان نێو شار، ئەویش‌و خوالێخۆشبوو (شێخ سەعیدی موفتی) لەگەڵماندا دەهاتن بۆ ئەوەی هاوڕێی پێشمەرگەکان بن‌و هانیان بدەن بۆ زیاتر دەست وەشاندن لە دوژمن. هەتا ئێستاش هەر بەردەوامە لە سەر تێکۆشان‌و کەسێکی خاوەن مێژووو ئەزموونە لە بواری نووسین‌و کاری رۆژنامەنووسیدا، چەندین کتێبی جۆراوجۆری هەیەو زۆر بە توانایە، لە هەردوو شۆڕشەکەدا خەباتی کردووەو زۆریش ماندووبووەو لە ١٩٨٠ – ١٩٨١دا گیراوەو لە (کەرکوك)و لە (بەغدا) زیندانی کراوەو ئەشکەنجەو ئازار دراوە. بەڵام هەر سەری شۆڕ نەکردووە بۆ دوژمن. هەرچەندە ئێستا تەندروستیی باش نییە، بەڵام هەر بەردەوامە لە سەر رێبازو کاری کوردایەتی‌و هیوای تەمەن درێژیی بۆ دەخوازم.

## جهمال بابان:

ساڵی ١٩٦٢ لهگهڵ شههیدان مامۆستا (حمه ئهمینو عهلی شیعهو حسێن غولامو شههیدی نهمر کاك جهمال بابان) له ناوچهی بهمۆ له گوندی (باراو) رێمان کهوته ماڵی ناسراوێکمان به ناوی (پیرۆزهی عهلی ئهحمهد بهگی ریشێن). ئهو کاتهی ئێمه گهیشتین، ناوهخت بوو، کهسیان لهماڵهوه نهبوو. زۆر ماندوو بووینو برسیمان بوو. (پیرۆزه خان) بانگی کرد لهیهك دوو کهسی دراوسێیان، که بێن یارمهتی بدهنو نانمان بۆ دروست بکهن. شههید (جهمال بابان)یش، که خزمی بوو، به (پیرۆزه خان)ی گوت:

"چیت دهوێ با یارمهتیت بدهین؟"

گوتی: "ئهمهوێ دوو مریشکم بۆ بگرن با سهری ببڕم بۆتان، ئهوه مریشکهکانه بزانم چۆن دهیانگری؟"

(جهمال بابان)یش پهلاماری لقێ داری تهڕیدا.

(پیرۆزه خان) گوتی: "ئهوه چی دهکهی؟"

گوتی: "ئێستا مریشکهکانت بهم داره بۆ دهکوژم."

به دارهکه کهوته نێو مریشکهکانو لهجیاتیی دووان چواری لێکوشتن، بهمهرجێ مریشکهکان ههندێکیان هی دراوسێکانیان بوون. ئێمهش گوتمان: "جهمال چیت کرد؟"

ئهویش گوتی: "بهخوا ئهمهندهم برسییه چاوم زهوی نابینێ."

دوایی دراوسێکان هاتن گوتیان: "ئەو پیاوە بۆ مریشکی ئێمەی کوشتووە؟" ئەویش پێی گوتن: "برسێتی رەگی هاری پێوەیە."
پاشان کەوتە قسەی خۆش لەگەڵ ماڵەکاندا، گوتی:
"جیاوازیی ماڵی پیرۆزەخانو ئێوە چییە؟ ئەگەر بهاتینایەتە ماڵی ئێوەش لەوانە بوو ئێوەش هەر مریشکتان بۆ سەربڕینایە."
ئەوانیش هیچ دلگران نەبوونو گوتیان:
"نۆشی گیانتان بێ."
بەڕاستی (جەمال بابان) پیاوێکی کۆمەڵایەتیو تێکۆشەرو ئازاو لێهاتوو بوو. لەکاتی شەڕدا زۆر بەهیممەت بوو، هیچ سڵی لە دوژمن نەدەکردەوە. ئەم پیاوە هاوڕێو دۆستی منالیی من بوو، زۆر سیفەتی چاکی تێدابوو، بەداخەوە بەدەستی ژن برایەکی خۆی شەهیدکرا لە (رانیە)، سەد رەحمەت لە گۆڕیو خوا لێیخۆشبێ.

## مولازم کەریم

دەرچووی کۆلێجی ئەفسەری پۆلیسی بوو لە بەغدا. دوای تەواوکردنی خوێندنی بە یەك مانگ، لە ساڵی ١٩٧٤دا پەیوەندیی بە شۆڕشی ئەیلوول ەوە کردو بە هیمەتو توانای خۆی بوو بە فەرماندەی بەتالیۆنو لە شەڕەکانی سەرکردایەتیدا لە چیای (بێشێ) بەشداریی کردو لەوێدا بریندار کرا.

من ئەو کاتەی مولازم کەریم م ناسی، فەرماندەی بەتالیۆنی چواری هێزی خەبات بووم. پیاوێکی تێکۆشەرو هاوڕێ دۆستو پاك بوو. له سەرەتای ژیانییەوە بۆ کوردایەتی تێکۆشاو هەڵگری بیروباوەڕی نەتەوەییو یەکبوونی کورد بوو. لەدوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلوول دوورخرایەوە بۆ خوارووی عیراقو له ئەفسەری پۆلیسیەوە کرا بە فەرمانبەر له شاری (عیمارە).

له ساڵی ١٩٧٨ەوە پەیوەندیی بە شۆڕشی نوێی گەلەکەمانەوە کردو له ڕێی پاسۆکەوە، که ئەو کاته باڵێکی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوو. له ساڵی ١٩٨٦دا ڕۆڵێکی گرنگی بینی له پرۆسەی ئاشتبوونەوەی گشتیی هێزەچەکدارکانی کوردستان. ئەو ماوەیه خۆی سەرپەرشتیی هێزەکەی پاسۆکی دەکرد. له شەڕەکانی قەیوانو ماوەت دا (کۆڕەنگ)و (خەجە لەرزۆك) شانبەشانی پێشمەرگەکانی له سەنگەردا دەجەنگا. پاشان له ساڵی ١٩٨٧دا له قەرەداخ بە خەستی بریندار کراو له نەخۆشخانەی شۆڕش له (بەرگەڵو) چارەسەر کراو یەکەم نەشتەرگەریی سێ کاتژمێری له نێو شۆڕشدا بۆ ئەو کرا.

دوای کۆچی دوایی‌ی (ئازاد مستەفا) بوو بە ڕابەری پاسۆك. پاشان لەگەڵ (حسك)و (پارتی گەل) بوون بە یەكو دوای ئەوەش له پارتیدا یەکیانگرت. مولازم کەریم بوو بە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی پارتی. ماوەیەك لێپرسراوی لقی پارتی بوو له سلێمانی.

زۆر بە داخەوە، لە رۆژی ٣/ ٨/ ١٩٩٥دا لە دوایین رۆژی شەڕی براکوژیدا لە گوندی (زیارەت)ی سەری رەش دا شەهید کرا.

مولازم کەریم لەبەر ئەوە زۆر لە نزیکەوە دەمناسی[5]، چەند جارێ دواوین دەربارەی شەڕی براکوژیو هەڵوێستی نیشتمانپەروەرانەی هەبوو دژی ئەو دیاردەیەو هەردەم دەیگوت: "ئەوە تاوانە !"

ئەم مرۆڤە تێکۆشەرە قارەمانە خاوەنی سەروەتو سامان نەبوو، دەستپاکو دەروون بەرز بوو. بیری لە خۆیوماڵو منداڵی نەدەکردەوە. هەمیشە دژی دزو جەردەو کردەوەی ناشرین بوو. کاتێ، کە شەهید بوو، خاوەنی هیچ نەبوو.

## شێخ جمالی خانەقا

پیشەی ئەرزوحاڵ نووسی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کاری پارێزەری بۆ دەستکورتو هەژاران دەکرد، پیاوێکی تێکۆشەرو نیشتمانپەروەرو لە خۆبوردوو بوو.

---

[5] زاوام بوو. مەهابادی کچ بوو بە هاوسەری. کچێکیان بوو، ئێستا تەمەنی نۆ ساڵە ناوی (شێنێ)یە، لە ٣/ ٨/ ١٩٩٤دا چاوی بە ژیان هەڵهێناوە.

حەمەی فەرەج لەگەڵ نەعیمەخانی ژنی و شێنێ کچی شەهید ملازم کەریم

## خوالێخۆشبوو حەمە ئەمینی مەلا فەرەج:

ناسراوبوو بە (رئیس حەمە ئەمین مەلا فەرەج). لە بنەماڵەیەکی ناسراوی سلێمانی‌یە. دەرچووی کۆلیجی ئەفسەری بوو. ئاگام لێبوو هاورێیەتیی لەگەڵ هەندێ لە کاربەدەستانی حکومەتی عیراقدا هەبوو، وەك: (حەماد شهاب)ی وەزیری بەرگری‌و (سەعدون غێدان)ی وەزیری ناوخۆی عیراق. بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٩٦٧دا لە بەکرەجۆ ناسیم، کە ئەوکاتە فەرماندەی هێز بوو.

پیاوێکی تێکۆشەرو لێهاتوو بوو. ژیانی تەرخان کردبوو بۆ خزمەتکردنی خەڵکی کوردستان.

لە شۆرشی ئەیلوول دا بوو بە فەرماندەی یەکەم بەتالیۆنی پێشمەرگە، لە شەدەڵە، کە سەر بە کەرتی چەمی ریزان بوو.

ساڵی ١٩٦٨و ١٩٦٩ بوو بە پارێزگاری هەولێر. خزمەتی زۆری خەڵکی کرد. بەهۆی پەیوەندییەکانی بە لێپرسراوانی رژێمی بەعسەوە، رۆڵێکی گرنگی بۆ وەرگرتنی هەندێ لە لاوانی کورد لە کۆلیجەکانی ئەفسەری سەربازی‌و پۆلیس‌و خولی مفەوەزو خولە تایبەتیەکان. پاش دەرچوونی بەیاننامەی ١١ی ئازار، گوازرایەوە بۆ بەغداو پاشان کرایە مولحەقی عەسکەری لە سەفارەتی عیلاقی لە مەغریب.

تا ئەو رۆژەی بە نەخۆشی گیانی بە خاك سپارد خاوەنی هیچ سامانێ نەبوو.

ئەوەندەی لە دەرەوە پێشمەرگە بوو ئامر هێزی (کاوە) بوو. خەڵکی ناوچەکە زۆر لێی رازی بوون. هەندێ لە کاربەدەستانی حکومەت زۆر گوێیان لەم پیاوە دەگرت، بە حوکمی هاورێیەتی‌و دۆستایەتی داوای لێکردین، ناوی چەند گەنجێکی بدەینێ بۆ ئەوەی هەوڵ بدا کارێکیان بۆ بدۆزێتەوە، ئەوە بوو زیاتر لە (٥٠) ناومان دایە بە ئاگاداری مەکتەبی سیاسی، کە خولێکیان بۆ بکرێتەوە، وەکو (مفەوەز)، بۆ ئەوەی ژیانێکیان بۆ دابین بکرێ‌و لە پاشەڕۆژیشدا سوودو قازانجیان لێبکرێ بۆ خزمەتی گەلەکەمان. زۆر لەوانە ئێستا ماون وەك (عقید)و (مقدم) ئێستا خزمەتی باشیش دەکەن. بەدۆزی نیشتمانی‌و نەتەوەییمان، ئەم پیاوە لەو کاتەشدا، کەوا پارێزگاری هەولێر بووە. کۆمەڵێ کاری چاکی کردووە، (لەساڵەکانی ١٩٦٨دا) بۆ خزمەتکردنی خەڵکی هەولێرو دەوروبەری، لە سەردەمی دەسەڵاتی ئیداری‌و حکومیدا زۆر کاری چاکی کردووە بۆ کەس‌وکاری شەهیدان‌و لێقەوماوان، خوا لێی خۆشبێ‌و هەزار رەحمەت لە گۆڕی.

## فایەق سەعید قەساب:

پیاوێکی نیشتمانپەروەرو بەوەفا بوو بەرانبەر بە خەڵکی کوردستان بە خۆی‌و ماڵ‌و منداڵیەوە. من لە ساڵی ١٩٦٣ەوە ئەم پیاوەم ناسیوە. خۆی‌و هەموو خێزانەکەیان لەگەڵ شۆڕشی خەڵکی کوردستاندا زۆر ماندوو

بوون، ماڵەکەیان بەرامبەر بارەگای (فرقە)ی (سلێمانی) بوو. ئەم پیاوە چەندین کەسی لە ماڵەکەیدا پەنا دەداو یارمەتیی خەڵکی زۆر دەدا، هەر دەرفەتێکی دەستکەوتایە بە مەنجەڵە چێشتو خواردنەوە رووی دەکردە ئەو شوێنانەی پێشمەرگەی تێدا بوو. ئەم خێزانە، بە تایبەتی ئەو دوو خوشکەی ناویان (ناجیو باجی خانم) بوو، هەمیشە هاتووچۆی دەرەوەیان دەکردو نامەیان دەهێنایە دەرەوەو وەڵامەکەیان دەهێنایەوە نێوشار. نازانم چۆن باسی ئەو ماڵە بکەم. بەڕاستی ئەوەندە دڵسۆز بوون بۆ شۆڕش، کە شایانی هەڵوێستە لە سەرکردنو ستایشێکی زۆرن، رەنگە ناویشیان لە ئەمڕۆدا پەراوێز خرابێو وەکو پێویست خزمەت نەکرابن. ئەم خێزانە لەگەڵ پێشمەرگەو تێکۆشەراندا ئەوەندە ئاشنابوون، سڵیان لە هیچ نەدەکردەوە. خوالێخۆشبوو کاك (فایەق) چەند جارێ گیراوەو دووچاری چەندین ناخۆشیو ئەشکەنجە بووە، لە ساڵی ١٩٧٤یشدا هاتە دەرەوە بۆ نێو شۆڕش.

## حەمە ئەمینی حاجی قاجر

ئەم مرۆڤە خۆیو بنەماڵەکەی بە درێژاییی شۆڕشی ئەیلولو شۆڕشی نوێ خەڵکێکی زۆر تێکۆشەرو نیشتمانپەروەر بوون، لە کاتی هەڵدێرو شکستدا زۆر جار، کە پێ دەگیراین ئەوان حەشاریان دەداینو

دەیانپاراستین‌و زۆر ڕێزیشیان لێدەگرتین، دەیان جاریش تووشی گرفت‌و کارەسات‌و ناخۆشی بوون لە سەر ئەم کارەیان. ئەوان ماڵەکەیان کردبوو بە بنکەیەك بۆ پێشمەرگە، زۆر لەوە زیاترن من لەم کتێبەدا باسیان بکەم، ئەم پیاوە تێکۆشەرە جێگەی ستایشە، چەند جارێ گێڕاویانەتەوە، کە پیاوانی ڕژێم‌و جاش چواردەوری ماڵیان داوە، گوایە ئەوان خەڵکیان بردووە لە ناو تورك‌و شەخەڵدا حەشاریان داوە.

## نازمی حەمە حەسەنی پۆلیس:

پێشمەرگەیەم بوو، لە کۆتایی‌ی شەڕی (زەڵم)دا نامەی کاك (شێخ عەلی)ی بۆ من هێنابوو، نەگەیشتە لای من شەهید کرا. هەرچۆنێ بێ لەو زنجیرە چالاکی‌و پێکدادانەدا لەچەمی (زەڵم) جاش‌و سەربازانێکی زۆر کوژراون، ئەوان بە بەرچاومانەوە تانکەکانیان دەکرد بە سپەر بۆ ئەوەی لاشەی مردوو بریندارەکانیان کۆبکەنەوە.

## ساڵح شارەزووری:

پیاوێکی تێکۆشەرو خوێندەوار بوو، لە (بەردەرکی سەرا)دا پیشەی ئەزروحاڵ نووسی بوو، یارمەتی خەڵکی زۆر دەداو ئیش‌و کاری خەڵکی ئاسان دەکرد. (شارەزووری) لە ساڵی ١٩٤٧دا یەکەم بەرپرسی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو لە هەڵەبجەدا بە هەموو ئازایەتی‌و

ڕۆشنبیری‌و زیرەکیی خۆیەوە هەوڵی دەدا خەڵکی لەدەوری حیزبەکەیان کۆبکاتەوە، هەروەها شیعری شۆڕشگێڕانەو کوردانەی دادەناو لە ساڵی ١٩٤٩ ـ ١٩٥٠دا هەفتانە لە ئێزگەی دەنگی (بەغدا)وە شیعرەکانی دەخوێنرایەوە. لە ساڵی ١٩٥١دا ماڵەکەی کەوتە بەر هێرشی پۆلیس‌و خۆیشی لەگەڵ (مەحمودی ئەحمەد بەگی سۆسەن)دا دەستگیر کرا. (شارەزوری) دیوانێکی بە جێهێشتووە، کە لە ڕۆژانی خەبات‌و کوردایەتی‌و مەردایەتی دەدوێن.

## حەمە سەعید حاجی حەمە عەزیز:

لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلولەوە کادرێکی لێوەشاوەو دڵسۆز بووە، زۆر لە کاتەکانی تەرخان کردوە بۆ ئیش‌و کاری کوردایەتی‌و هەتاکو ئێستاش هەر خاوەنی هەڵوێستە، بەڕاستی ئەوەندەی من ناسیومە پیاوێکی زۆر دڵسۆزو خەمخۆر بووەو بە بنەماڵەش خاوەنی هەڵوێستی کوردایەتی بوون.

## شێخ عەلی:

عەریف پۆلیس بوو، لە شۆڕشدا (عدد رەشاش) بوو، لە هەموو شەڕەکانی (چەمی زەڵم)و چەند شەڕێکی‌تردا بەشداری کردووە، بەڕاستی پیاوێکی زۆر تێکۆشەرو قارەمان بوو خوا لێی خۆش بێ.

## شێخ جەمالی شێخ مستەفا قەرەداخی

کادرێکی تێکۆشەرو لێهاتووی کوردایەتی بوو، هەموو کاتەکانی خۆیو ماڵو منالی تەرخانکرد بوو بۆ خزمەتی خەڵکی کوردستان. ئەم پیاوە زۆر لێهاتوو بوو. هەر کاتێ کارێکت پێ بسپاردایە، بە شەو بوایە، یان بە رۆژ، زۆر بە رێکوپێکی ئەنجامی دەدا. پیاوێکی بێ تەماعو سادەو کراوە بوو، لە بنەماڵەیەکی دیاری قەرەداخو سەر بە بنەماڵەی (شێخی مەردۆخی) بوون، زۆر خۆشەویست بوو لەنێو خەڵکداو هەموو ئاواتی رزگاری کوردستان بوو. ئەم پیاوە هیچ درێخی نەکردووە لە خزمەتکردن بەرامبەر گەلو نیشتمانەکەی.

## عەزەی ترومبێلچی:

بە (مامە عەزە) بەناوبانگ بوو. ئەو بە بنەماڵە تێکۆشەرو نیشتمانپەروەر بوون، باوکی شەهید (دارا) بوو. ئەم پیاوە هەموو کاتەکانی تەرخان کردبوو بۆ شۆڕشی گەلی کوردستان، لە ساڵی١٩٦٢دا بوو بە پێشمەرگەو لە (بیارە) کردمان بە بەڕێوەبەری گرتووخانە. کەسێکی زۆر لێهاتوو بوو، وازی لە هەموو سەروەتو سامانی خۆی هێنابوو لە پێناوی بەرژەوەندییەکانی خەڵکی کوردستان. هەرچەند بە تەمەن بوو بەڵام زۆر تێکۆشەرو ماندوونەناس بوو. خوا لێی خۆش بێو سەد رەحمەت لە گۆڕی. شەهید (دارا)ی کوڕیشی زۆر قارەمان بوو،

پاسەوانی بەڕێز (مام جەلال) بوو، لە ساڵی ١٩٦٧دا لە تاسلۆجە بۆسەیەکیان بۆ (مام جەلال) دانا بوو، لە ئەنجامدا (دارا) شەهید بوو. کوڕێکی زۆر لێهاتوو خاکیو شۆڕشگێر بوو سڵی لە هیچ چالاکیو ڕووبەڕووبوونەوەیەك نەدەکردەوە.

## شەهید عومەری حاجی سەعید:

کادرێکی تێکۆشەری لێهاتووی خۆنەویست بوو، ئەندامی لیژنەی ناوچەی هەڵەبجە بوو، لە لایەن جاشە خۆفرۆشەکانەوە لە ناوچەی (نەورۆڵی) لە گوندی (چرۆسانە) گیراو بە دیلی بردیان بۆ ناحیەی (سیروان) لە ڕێگا باڵێکیان شکاند. پاش ئەوەی ئازارێکی زۆریاندا لە زینداندا بەبێ ئەوەی لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکەنو هیچ لێپێچینەوەیەکی دادگایی لەگەڵدا ئەنجام بدەن، ڕۆژانە پیاو خراپەکان خۆیان سزایان دەداو دوای دووهەفتەیەکیش بەدوای ئۆتۆمبێلدا ڕایانکێشا هەتا شەهید بوو.

## حەمە صادق:

چایخانەیەکی هەبوو لە زەلەکێ لە نێوان گوندی (عەبابەیلێ)و دەرەمەڕدا. لە وێدا باخێ بوو تاقە ماڵە خۆی تێدا بوو، لەدوای ١٩٦١وە زۆربەی زۆری کاتەکان لەو ناوچە دەمایەنەوەو زۆر خزمەتی دەکردین

بەبێ بەرامبەر. بەڕاستی ئەم پیاوە پیاوێکی چاك بوو خوا لێی خۆشبێ.

**سید حەسەن سەید محەمەد نانەوا:**

کادرێکی زۆر تێکۆشەرو بە ئەمەك‌و ماندوویی نەناس بوو، چەند جارێ لەلایەن حکومەتەوە گیراو سزادرا. دیار بوو هەموو کاتەکانی تەرخان کردبوو بۆ خزمەتی کوردو کوردایەتی. بەردەوام لەگەڵ شەهیدان کاك (ڕەووف حاجی حمە عەلی)و (نوری حمەی نانەوا)دا کارو چالاکیی دەکرد..

**سالح مەلا محەمەد:**

لە ساڵەکانی ١٩٥٠وە لە سەر ڕێبازی کوردایەتی بێ لادان‌و دوو دڵی بەردەوام بوو، بەبێ هیچ تەماع‌و بەرژەوەندییەك بۆ کەسی خۆی. ئەم پیاوە هەرگیز کۆڵی نەداوە. هەرچەند زۆریش کەوتووە لە سەری، تا ئێستاش بەداخەوە ئاوڕێکی لێنەدراوەتەوەو هیچی بۆ نەکراوە. وەکو مامۆستایەك ئەرکی پیرۆزی خۆی رادەپەڕێنێ لە هەڵەبجەی شەهید.

**سەعەی جەواهیر:**

پیاوێکی کورد پەروەر بوو. لە هەموو کاتێکدا لایەنگیری خەڵکی هەڵەبجە بوو. بەشداریی لە ئەنجومەنی پیاوماقوڵانی هەڵەبجەدا

دەکرد، زۆر دڵسۆزیی دەنواند بەرامبەر بە خەڵکەکەی بەتایبەتیو کوردستان بەگشتی. خوا لێی خۆش بێ.

## ئەحمەدی دادی:

پیاوێکی زۆر تێکۆشەرو کورد پەروەربوو، ئەو کاتە لێپرسراوی لقی ڕێکخستنی پێشمەرگە بوو بە سیفەتی رابەر سیاسی، زۆر کاری نهێنی ڕێکخستنەکانو پێشمەرگایەتی دەکرد بە شێوەیەکی زۆر ڕێكوپێك. ئەم پیاوە هەر چەند باسی بکەیت زۆر کەمە لە رووی جوامێریو شەهامەتییەوە لە شۆڕشی ئەیلولو شۆڕشی نوێدا.

## حەمە رەحیم بەڵخەیی

پیاوێکی تێکۆشەرو لێهاتوو بوو، چ وەکو کادرو چ وەك پێشمەرگە کاری دەکرد. ئەوکاتانەی ئێمە لە دەوروبەری (وەزگێڵ)و ناوچەی (هەورامان) بووین، زۆربەی زۆری زانیاریو هەواڵ لە ڕێگەی ئەمەوە دەگەیشت پێمان، خوا لێی خۆشبێو سەد رەحمەت لە گۆڕی.

## برایمی حمە خورشە:

ناسراوبوو بە (بلەی حەمە خورشە). ئەم پیاوە رۆڵێکی باڵای هەبوو لە دروست بوونی پێشمەرگەی نێوشاردا. لە ساڵەکانی ۱۹٦۰وە بێ سلکردنەوە لە هیچ لایەك رۆڵو چالاکیی پیاوانەو جوامێرانەی هەبوو،

ماڵەکەیشی دیوەخانی پێشمەرگەو پیاوە سیاسییەکانی کوردایەتی بوو، دۆستێکی نزیكو خۆشەویستی بەڕێز (مام جەلال)و مامۆستا (ئیبراهیم ئەحمەد) بوو. زۆر بەداخەوە لەلایەن چەند کەسێکی بێویژدانو گێرە شێوێنەوە شەهید کرا بێ ئەوەی بزانرێ هۆی شەهیدبوونەکەی چی بوو، ئەمەش بووە هۆی دلگرانیەکی زۆر لەناو خەڵکە چاکەکەی شۆڕشدا. خوا لێی خۆشبێو سەد رەحمەت لە گۆڕی.

## عەلی کووڕ خورماڵی:

لە ساڵەکانی ١٩٦٠وە بەردەوام بووە لە خەباتی گەلەکەماندا. پیاوێکی زۆر تێکۆشەرو لێهاتوو بووە، کەسێکی ماندونەناسو جوامێرو لەخۆبوردووو خاکی بوو. لە پێناوی بەرژەوەندیی خەڵکی کوردستاندا، خوا لێی خۆشبێو هەزار رەحمەت لە گۆڕی.

## خوالێخۆشبوو حاجی نامیق خەراجیانی:

پیاوێکی زۆر جوامێرو لێهاتوو بوو، لە ساڵی ١٩٥٤ەوە بووینە هاوڕێی یەکتر. ئەو کاتانە بوو، کە بۆ کەسابەت دەهاتە هەڵەبجە. پەیوندییی دۆستایەتیی پتەو لە نێوانماندا دروست بوو. زۆر بە وەفا بوو بەرامبەر بە هاوڕێکانی. لە سەرەتای ساڵەکانی ١٩٥٩دا رۆڵێکی باشی هەبوو. لە هەموو وەختو ناوەختێکدا، هەر کارێکت پێ بسپاردایە، زۆر بە

رێك‌وپێكی ئەنجامی دەدا، وەكو كڕینی چەك‌و تەقەمەنی‌و پێویستی‌تر بۆ پێشمەرگەو حیزب، بەبێ تەماع‌و بەرژەوەندیی كەسیی خۆی. ئەم پیاوە چەند جارێ گیراو ئەشكەنجەدراوە، لەگەڵ چەندین پیاوی تێكۆشەریتر وەكو (عەریف سەعید)و (مەحمودی شاه محەمەد)و (شێخ جەمالی بەر خانەقا)و (عەبدوڵڵای عارف)و (عەلی خەبات)و خوالێخۆشبوو (فەتاحی حاجی عەبدولكەریم)و (عەبدوڵڵای مەلا عەلی)و چەندین پیاوی تێكۆشەرو ناوداری‌تر.

## قادر تەگەرانی:

ناسراو بوو بە (قالە تەگەرانی). لە ساڵی ١٩٥٩ەوە ناسیومە، پیاوێكی زۆر دڵسۆزو نیشتمانپەروەر بوو، هەموو سیفەتێكی پیاوەتی‌و كوردایەتیی تێدا بوو، لە پشتی ماڵەكانی تەگەرانەوە چەند خانوویەكی دروستكردبوو بۆ میوان‌و كادرەكانی كوردایەتی چ لە دیوی ئێران‌و چ لە كوردستانی خۆمان، كە بە نهێنی لای ئەو دەحەوانەوەو خزمەتی زۆری دەكردن. هەر كەس بۆ هەركوێ بیانویستایە بڕۆن، ڕێنمایی‌و ڕێبەری دەكردن‌و یارمەتی دەدان. زۆربەی كاتەكان (مەلا ئاوارە)و ئەحمەد تۆفیق)و چەند كەسێكی‌تر، كە خەڵكی ئێران بوون، لای كاك قادر تەگەرانی خۆیان حەشار دەدا. بێجگە لە كوردەكانی خۆمان، ئەم پیاوە لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلولەوە زۆر یارمەتیی پێشمەرگەو كادرو

لێپرسراوانی دەداو لەسەر ئەم كارە پیرۆزەی بەردەوام بوو تا ساڵی ١٩٦٤. من ئاگادارم، كە ئەو زۆر لە خوالێخۆشبوو (مەلا مستەفا)وە نزیك بوو، ئەویش گوێی بۆ دەگرت، چەند جارێك هاتووچۆی دەكرد. لە نێوان برادەرانی مەكتەبی سیاسیو (مەلا مستەفا)، بۆ چارەسەركردنی ناكۆكیەكانی نێوخۆ. بەڵام زۆر لە پیاوە هەڵپەرستەكانی دەوروبەری (مەلا مستەفا) پێیان خۆش نەبوو ئەوەندە رێز لە (قادر تەگەرانی) بگیرێ. ئەوەبوو، لەدوای وتووێژەكەی ١١ی ئازار هەندێ لە لێپرسراوانی پارتی كەوتنە دژایەتیی (قادر تەگەرانی) تووشی بێزاریو نیگەرانی بوو. لە ئەنجامدا چووە لای حكومەتو ماوەیەك لایان مایەوە، ئەوانیش پاش ماوەیەك تێگەیشتن، كە ئەم پیاوە لەناخەوە خۆشەویستی زۆری هەیە بۆ میللەتەكەیو باسی كوردو شۆڕش دەكا بێ سڵكردنەوە لەحكومەت. زۆرجار دەری دەبڕی، كە ناچاریان كردووم هاتوومەتە لای حكومەت. ئەمەشی بە خیانەت دەزانی. چەند جارێكیش پەیوەندیی بە برادەرانی مەكتەبی سیاسییەوە كرد، بەڵام برادەران كەسیان نەیان دەتوانی بەرگریی لێبكەن. بۆیە هەر مایەوە لای حكومەتو ئەوە بوو بە خۆیو هەموو هێزەكەیەوە، كە زیاتر لە (٣٠٠) كەس دەبوون، تاكو ئێستاش بێ سەرو شوێنن، نازانرێ چۆن كوژراون، یان چییان بەسەردا هاتووە. ئەمەش چەند كەسێكی بێ ویژدان بوون بەهۆی ئەوەی ئەو

پیاوە تێکۆشەرە تووشی ئەو گرفتو تەنگژەیە ببێو بە سەروماڵەوە تیابچێ.

ئەوەی شیاوی نووسینە، لە ساڵی ١٩٧٧دا رژێم لە گۆڤاری (الوقائع العراقیە)دا، کە گۆڤارێکی رەسمیە بۆ کاروباری یاسایی، بەڕێوەبەرێتی (الامن العامە) دانی بەوەدانا، کە (قادر تەگەرانی)و تاقمەکەی لێپێچینەوەی یاساییان لەگەڵدا کراوەو ناوی هەموویانی بە لیستێ بڵاوکردەوە، کە بزربوون. بەمەش رژێم دانی بەودا نا، کە (قادر تەگەرانی)و هاوڕێکانی نەماون، خوا لێیان خۆش بێ.

## کەریمی ئەحمەد هۆمەر:

پیاوێکی دڵسۆزو خاوەن هەستی کوردایەتی بوو، زۆر دۆستێکی خۆشەویستی کاك (عومەر دەبابە) بوو، خاوەن هەڵوێستی کوردایەتی بوو، لە هەر کاتێکدا کارێکت پێ بسپاردایە، زۆر بە رێكوپێکی بەرەوپیری دەهاتو جێبەجێی دەکرد. ئەم پیاوە قارەمانە ئەوەندەی من ناسیومە هەرگیز درۆی نەدەکرد، هەمیشە لایەنگیری پیاوە چاکەکان بوو، ئەویش هەر بەو ئاواتەوە سەری نایەوە. خوا لێی خۆشبێو سەد رەحمەت لە گۆڕی.

## مولازم حمه شەوقی:

لێپرسراوی هێزی بەرگری بوو لە (بێشێ). ئەوکاتەی نەخشەی بەرەی جەنگمان وەرگرت، هات بۆ لامان بۆ بەخێرهاتن. بەڕاستی رۆڵێکی زۆر قارەمانانەی هەبوو. کوردێکی نیشتمانپەروەرو لێهاتوو بوو. هەر چەند پێشتر دەمناسی، بەڵام دڵخۆش بوو، کە بەو شێوەیە دیم لەو شەڕگەیەدا، کە هێزو رۆحیەتێکی شۆڕشگێڕانەی پێدا بووین. بەڵام بەداخەوە ئەویش بە ئاواتی رزگاری نەگەیشت.

## محەمەدی حاجی فەرەج:

ناسراوبوو بە (حەمەی فەرەج ئەفەندی). ئەم پیاوە بە سەرو ماڵ لە سەرەتای دروستبوونی ئەم شۆڕشەوە لەگەڵماندا بوو، خاوەنی دەسەڵاتی باش بوو، ماڵەکەیشی هەمیشە دیوەخانی پێشمەرگەو کادرە سیاسییەکان بوو. لە هەرکاتێکدا پێویستمان بە ئۆتۆمبیل بوایە، یان هەر شتێکیتر، ئەو خۆی بە خاوەنی هیچ شتێ نەدەزانی لە ئاستماندا، خەڵکێکی زۆریش لایەنگرییان دەکردو لە دەوری خڕدەبوونەوە، لەلایەن حکومەتیشەوە بە حوکمی تواناو دەسەڵاتی خۆی زۆر رێزیان لێدەگرتو حسابێکی جیایان بۆ دەکرد. ئەگەر هەر دۆستایەتییەکیش لەگەڵ پیاوەکانی میری لەو سەردەمەدا بکردایە، ئەوا بۆ بەرژەوەندیی میللەت بوو، زۆر بە هەڵوێستو جوامێر بوو، بوێرانە سڵی لە هیچ شتێ

نەدەکردەوە. ئەوە بوو لە (منع التجول)ە بەزیادەکەی ۹ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٣دا، (کەمال) کوڕە گەورەیان لەگەڵ ئەو خەڵکەدا گرتو یەکێ لەوانەی شەهید کران[6]. ئەمانە هیچ باکێکیان لە مردن نەبوو. پێش ئەوەی شەهیدبکرێن کاربەدەستانی میری چووبوونەلایو داوای هەندێ زانیاریان لێکردبوو، بەڵام ئەو زۆر بە توندی وەڵامی دابوونەوەو گوتبووی پێیان:

"چیتان لەدەست دێ درێخی مەکەن، من خیانەت لە میللەتەکەی خۆم ناکەم."

## دیاری بەگی حامی بەگ:

ئەوەندەی من لە نزیکەوە ئاگادار بوویم، ئەو هەر لە سەرەتای شۆڕشی ١٩٦١وە تاکو کۆتایی شۆڕشەکە خزمەتی شۆڕشی کردووەو ماڵەکەشی هەموو کاتێ ببووە جێی حەوانەوەی پێشمەرگەو لانەی شۆڕشگێڕان، خۆیشیو کوڕەکەیشی پێشمەرگە بوون، بەبێ ئەوەی ڕۆژێ لە ڕۆژان لەگەڵ حکومەت، یان لەگەڵ نەیارەکانی شۆڕشی کورددا سازشو بێ هەڵوێستییان نواندبێ. ئەم پیاوە هەر لە سەرەتاوە لەگەڵ پارتیدا بوو،

---

[6] تێبینی: خوالێخۆشبوو, حەمەی فەرەجە فەندی لەلایەن لەلایەن ڕژێمەوە گیراو تووشی ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆر بوو, پاش ماوەیەك لەدوای ۹ی حوزەیرانی ١٩٦٣ لەنەخۆشخانەو لەئەنجامی ئەو ئازارو ئەشکەنجەو خەفەتی گرتنی کەمالی کوڕی بێسەرو شوێنیانەوە کۆچی دوایی کرد.

هەموو ئاواتی رزگاری کوردو کوردستان بوو، هەرچەند سەروەت‌و سامانێکی زۆریشی هەبوو، بەڵام هەمووی لە پێناوی شۆڕشی کوردستاندا خەرج دەکرد، زۆر دڵسۆزو تێکۆشەر بوو، لەم دواییەدا گوزەرانی باش نەبوو هەتا مرد. هەر کرێنیشین بوو لەخانوویەکی (کاکە حمە بۆر)دا، تەنانەت وەکو پێویست کرێ خانووەکەشی بۆ نەدەدرا.

## شێخ مستەفا شێخ عەلی:

خەڵکی ئاوایی (حەمەی کەرەم) بوو. پیاوێکی زۆر دڵسۆزو زۆر خزمەتی پێشمەرگەو کادرەکانی رێبازی کوردایەتی دەکرد. زۆرجار، لە کاتی پێویستدا دەهات بە هانامانەوە بۆ رێنماییو دەنگ‌وباس. پیاوێکی قسەخۆش‌و زاناو لەسەرخۆ بوو، خوا لێی خۆشبێ‌و سەد رەحمەت لە گۆڕی.

## عەزیز بەگی جوانڕۆیی:

پیاوێکی ناوداری کوردستانی ئێران بوو، لە ساڵی ١٩٦٧ لای ئێمە پێشمەرگە بوو. زۆر نیشتمانپەروەر بوو، تەمەنی (٦٦) ساڵ دەبوو، بە سەلیقەو لێهاتوو بوو. ماوەی (٣)ساڵ بەیەکەوە بووین. زۆر لەمنەوە نزیك بوو. ئەم پیاوە ئاوو چای نەدەخواردەوە! دوو ئێستری پێبوو،

هەروەها دووسێ پێشمەرگەی لەگەڵدا بوو، هەموو پێویستییەکانی خۆی بە ئێسترەکانەوە بوو، وەکو: نوێنو جلو بەرگو قاپو قاچاغ، تورەکەیەکی پێبوو پڕبوو لە دۆینە، دۆینەی دەکردە ئاوو دەیخوارد. زۆرجار سەرمان دەنایە سەری، دەمانگوت:

"تۆ چۆن بە بێ ئاو خواردنەوە دەژیت؟"

دەیگوت: "حەزی لێناکەم!"

لە بنەماڵەیەکی ناودار بوو، جێگەی دیارێکراوی نەبوو، وەك کۆچەر هەفتەی لە شوێنێ بوو، ئەگەر شەڕێ ببوایە، زۆر بە دەستو زۆر ئازا بوو زۆر بێ تەماع بوو،ماڵو سەروەتو سامانێکی زۆری هەبوو لە ئێران. بەڵام هەمووی بەجێهێشتبوو، ببوو بە پێشمەرگە.

## حەمەی حاجی تایەر:

لە ساڵەکانی ١٩٥٩وە ناسیومە. ئەو کاتە ئەندامی (پ.د.ك) بووە. پێشتریش لە ساڵەکانی ١٩٥٠دا بە نهێنیی ئیشوکاری کوردایەتیی کردووە. بەڕاستی پیاوێکی تێگەیشتووو تێکۆشەرو لێهاتوو بووەو خاوەنی سەروەتو سامانێکی باش بوو، بەڵام وازی لە هەموو بەرژەوەندییەکی خۆی هێنا بۆ خزمەتکردنی خەڵکی کوردستان، لە هەردوو شۆڕشەکەدا. ئەم پیاوە تێکۆشەرە هەتا ئێستاش هەر بەردەوامە لەسەر خەباتو تێکۆشان بۆ خزمەتی میللەتەکەیو بەبێ

ئەوەی هیچ شتێ کاریگەریی خراپی تێکردبێ، بەڵکو هەر خەریکی ئیش‌و کاری کوردایەتییە. هەرچەندە بەداخەوە ئێستا تەندروستیی باش نییە.

ئەم بنەماڵە گەورەیەی (سلێمانی) بەناوبانگن بە (حەمەی حاجی تایەر) تا ئێستا کرێچیی خەڵکن، هیچ کاتێ بیریان لە پارەو دەسەڵات نەکردۆتەوە بۆ خۆیان. هەڵبەت ئەمەش سەروەت‌و سامانێکی زۆر گەورەیە بۆ ئەو خەڵکانە، کە بەرژەوەندیی خەڵکی کوردستانیان خستۆتە پێش بەرژەوەندییەکانی خۆیانەوە.

## حوسە رەشی خەیات:

ئەم پیاوە تێکۆشەرو بە وەفای میلەتەکەمان بووە، بەدرێژاییی هەردوو شۆڕشەکە هیچ درێخی نەکردووە. ساڵی (١٩٨٧) گیراوەو حوکمی لە سێدارەدانی بەسەردا دراوە، بەڵام بە هۆی لێبوردنی گشتییەوە رزگار کراوە. ئەم پیاوە باری تەندروستیی زۆر خراپەو تووشی نەخۆشیی کوشندە بووەو زۆر هەوڵی چارەسەری دراوە. بەڵام بەداخەوە هیچ چارەیەکی نییە. ئەم پیاوە نە ژن نە منداڵ نە کەسێکی وای نییە. بەڕاستی پیاوێکی زۆر بەهیمەت‌و بەتوانایەو بەم وەزعە ناتەواوەی خۆیشیەوە هەموو کاتەکانی تەرخان کردووە بۆ خزمەتی میلەتەکەی. ئەم پیاوە تێکۆشەرە لەگەڵ ئەو رەوشە نالەبارەی خۆیدا زۆر دڵخۆشە

بەم ئازادیو رزگارییەی ئیمڕۆو داواکارین لە خوای گەورە شفای بۆ بنێرێ.

## رەفعەتی مەلا:

بنەماڵەکەی خاوەنی خەباتێکی دووردرێژن، چەندین شەهیدی ناوداریان هەیە وەکو برازاو خوشکەزاو تووشی چەندین دەربەدەریو ماڵ وێرانیو کارەساتی جۆراو جۆر بوون. ئەم پیاوە بەڕاستی خاوەن هەڵوێستو بەتوانایە، یەکێکە لەو مرۆڤە باشانەی، کە جێگەی رەزامەندیی خەڵکی کوردستانە. دەست پاكو داوێن پاكو بەوەفایە.
هەڵبەت زۆر شتیتر هەیە باسی بکەین لەسەر ئەم بنەماڵەیە، بەڵام هەر ئەوە دەتوانم بڵێم وەکو دۆستێکی ئەم بنەماڵەیە، هەموو سیفەتێکی نیشتمان پەروەرییان تیایەو بەرامبەر بە هاوسەنگەرەکانیان بەوەفان.

## مامۆستا سەید حەسەن بەرزنجەیی:

لە ساڵی ١٩٦٠ ـ ١٩٦١وە ئەم پیاوە بەردەوام بووە لە سەر خەباتی رەوای گەلەکەمانو کۆڵی نەداوە، لە شۆڕشی ئەیلولو شۆڕشی نوێی گەلەکەماندا بەشداریکردووە. پیاوێکی ناسراو پیاوێکی تێکۆشەرو لێهاتوو بووە، تووشی هەزارویەك ناخۆشیو نارەحەتیو گرتن بووە،

چەندین جار گیراوە لەلایەن رژێمی عێراقەوە، ئەم پیاوە خاوەنی هەڵوێستی نیشتمانپەروەرانە بووە بەخۆیو خێزانەکەیەوە زۆر هیلاك بوون لەگەڵ شۆڕشی گەلەکەماندا.

## حاجی نامیق خەراجیانی :

ئەم پیاوە زۆر تێکۆشەرو نیشتمانپەروەرو زۆر خەمخۆری خەڵکی کوردستان بوو. لە ساڵەکانی ١٩٦١ تاکو راپەڕین لە هەر کاتێکدا پێویستمان بە چەك، یان تەقەمەنی بوایە، لە رێگەی ئەوەوە دەیتوانی بۆمان دابین بکا، بێ ئەوەی بەرژەوەندیی تایبەتی خۆی تێدا بێ. چەند جارێکیش لەلایەن حکومەتەوە گیراوەو ئازاری زۆریان داوە. بەڵام ئەم پیاوە بەتوانایە لەهەموو کۆڕو کۆمەڵێکدا خاوەنی هەڵوێستی نیشتمانپەروەرانە بوو، ئەویش هەر بەو ئاواتەوە سەری نایەوە. هەر چەندە بە چاوی خۆی پەرلەمانو حکومەتی کوردستانی دی، بەڵام زۆر نیگەران بوو بە شەڕی نێوخۆو. هەموو جاران باسی ئەوەی دەکرد دەبێ هەموومان هەوڵ بدەین بۆ ئەوەی کۆتایی بەم شەڕی ناوخۆیە بهێنرێ.

## عەلی مام رەزا :

کادرێکی دڵسۆزو لێوەشاوەو بەتوانا بوو. لە سەرەتای ساڵەکانی ١٩٥٩وە ناسیومە. ئەم پیاوە تێکۆشەرە زۆر خەمخۆری خەڵکی کوردستان بووەو

شەوو رۆژی خستۆتە سەریەك بۆ خزمەتکردنی میللەتەکەی. ساڵی ١٩٦٠ بووە بە لێپرسراوی ناوچەی (هەڵەبجە)و زۆر ئیشی چاکی دەکردو لەناو خەڵکیدا رێزێکی تایبەتی هەبوو. ئەم پیاوە، کە بەبێ بەرانبەر لە رۆژە رەشەکاندا بەرگەی هەموو ناخۆشیەکی گرتووە، بەڵام بەداخەوە وەکو پێویست لێی نەپرسراوەتەوە. ئێستا نەخۆشەو لە ماڵەوە کەوتووە، خوا شیفای بۆ بنێرێ.

## فەوزی رەشید نامیق:

کادرێکی بەتواناو لێوەشاوەی کوردایەتی بوو. لە هەموو بوارەکاندا لەشاخو لەشار بەردەوام بووە. لەسەر خزمەتی خەڵکی کوردستان. ئەم پیاوە تێکۆشەرە تاکو ئێستاش خاوەنی هیچ سەرمایەیەك نییەو کرێچییە. بەڵام من دەزانم ئەم جۆرە پیاوانە بەبێ لادان لە هەردوو شۆڕشەکەدا لەگەڵ ئەرکو ئازاری گەلەکەیاندا ژیاون، لە رووی خەباتیانەوە زۆر بە دەوڵەمەندیان دەزانم لەنێو میلەتەکەماندا.

## کەمال شاڵی:

پیاوێکی تێکۆشەرو نیشتمانپەروەر بووە. لەتەمەنی منداڵییەوە تاکو ئێستا سەرقاڵی خەباتو تێکۆشان بووە. چەند جارێکیش لەلایەن رژێمی (بەعس)ەوە گیراوەو تووشی ئازارو ئەشکەنجەی زۆر کراوە،

هەروەها حوكمی لە سێدارەدانی دەرچووە لە ساڵی (١/٥/ ١٩٨٧)، بەڵام بە لێبوردنی گشتی لە ١٤/٩/١٩٨٩؟ لەزیندان رزگاری بووە. هەتا ئێستاش هەر بەردەوامە لەسەر خەبات‌و تێكۆشانی خۆی‌و زۆر خۆشەویستە لەناو خەڵكی كوردستاندا، بەتایبەت خەڵكی سلێمانی. ئەم پیاوە دەرچووی كۆلێژی كشتوكاڵییەو لە ساڵی ١٩٩٢دا بووە بە ئەندامی پەرلەمان. هەروەها ئەم پیاوە خۆی‌و خێزانەكەی (شوكریە خان) كچی تێكۆشەری بەناوبانگی كورد (حوسینی مام ڕەشە)، وەكو بنەماڵەیەك هیچ لە پێناوی بەرژەوەندیی خەڵكی كوردستاندا، لە هەردوو شۆڕشی ئەیلول‌و نوێدا درێخییان نەكردووە.

## ساڵح هەژار:

لە ڕۆژە ڕەشەكان ساڵەكانی پەنجاكاندا ئەم پیاوە لەناو دێهاتەكانی دەورروبەری (هەڵەبجە)دا دەستێكی باڵای لە هاندانی خەڵكدا هەبوو دژی حكومەتی پادشایەتی‌و لەو ساڵانەدا چەند جارێ گیراوە لە ساڵەكانی (١٩٥٢ — ١٩٥٣). لە دوای ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨، ئەم پیاوە هەر بەردەوام بووە لەسەر خەبات‌و تێكۆشان بە شیعرو نووسین‌و بە چەندین جۆریتر خەباتی كردووە بۆ ڕزگاری‌و ئازادی میللەتەكەی‌و چەندین كتێبی جۆراوجۆری هەیەو هەمووی بۆ هاندانی خەڵكە دژی داگیركەران‌و خۆفرۆشەكانی نێو شۆڕشەكەمان. ئەم پیاوە بەڕاستی زۆر

بەتوانا بوو، بەروبوومی شۆڕشی رزگاری خوازی گەلەکەی نەخوارد، کە چەندین ساڵ بوو خەباتی بۆ دەکرد. زۆر بە داخەوە بەو ئاواتەوە سەری نایەوە خوا لێی خۆشبێ. یەکێ بوو لەو نیشتمانپەروەرانە لەو کاتەدا خۆی زۆر هیلاك دەکرد بۆ میللەتەکەی بەبێ سڵ کردن لە هیچ کەمو کۆسپێك کاك صالح هەژار دەستی نوسینو شیعری هەبوو چەندین کتێبو پەخشانی هەیە کەوتۆتە بەردەستی خوێنەران ئەویش هەر بەو داخەوە سەری نایەوە بێ ئەوەی هیچ بەروو بومێکی ئازادی ببینێ.

## علی حمە لەواش:

پیاوێکی تێکۆشەرو نیشتمانپەروەرو شاعیرو نووسەر بوو. زۆر قسەخۆش بوو، خاوەنی هەڵوێستی نیشتمانپەروەرانە بوو. بەبێ سڵکردنەوە لە هیچ هێزو دەسەڵاتێ، لە زۆر شوێندا باسی شۆڕشی رەوای میللەتەکەمانی دەکرد. ئەم پیاوە نیشتمانپەروەرە چەند کتێبێکی هەیە، کە باسی بە سەرهاتو نەهامەتیی میللەتەکەمان دەکا. چەند جارێ لەلایەن رژێمەوە دەست گیرکرا لە ساڵی ١٩٥٥ – ١٩٥٦دا، بەڵام هیچ سەری بۆ فرمانی رژێم شۆڕنەکرد. بەم هۆیەشەوە تووشی ئازارو ئەشکەنجەی زۆر کرا، ئەویش بە ئاواتی رزگاری گەلەکەیەوە سەری نایەوە. خوا لێی خۆشبێ.

## عەریف سەعید:

مشهور بوو بە (مەتارە لەمل). ئەم كادرێكی زۆر تێكۆشەری كوردایەتی بوو لە رۆژە رەشەكاندا، چەند جارێ بینیم نەخۆش بوو هەر باسی ئەوەی دەكرد كەی بێ‌و میلەتەكەمان رزگاری بێ‌و هەمووامان ماندوویمان بحەسێتەوە. بەڵام بەداخەوە ئەم پیاوە تێكۆشەرە بەو داخەوە سەری نایەوە. خوا لێی خۆشبێ‌و سەد رەحمەت لە گۆڕی.

## دكتۆر فوئاد بابان:

بە بنەماڵە تێكۆشەرو نیشتمانپەروەر بوون، ئەویش بەهۆی لێوەشاوەیی‌ی خۆیەوە لە ژیانیدا تووشی هەموو جۆرە گرتن‌و دوورخستنەوەیەك بووە.

## رەئوفی حاجی حەمە عەلی:

لە ساڵەكانی ١٩٦٠ ـ ١٩٦١دا لێپرسراوی لیژنەی ناوچەی هەڵەبجە بوو. ئەم پیاوە ژیانی باش بوو، بەڵام هەموو كاتەكانی تەرخان كردبوو بۆ رزگاریی گەلەكەی. زۆر بەداخەوە ئەویش بەروبوومی شۆڕشەكەی نەدی. خوا لێی خۆشبێ.

## کەماڵ خەفاف:

پیاوێکی تێکۆشەرو ناودار بوو، پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلول بوو، بە پلەی ئەندامی ناوچە یەکێك بوو لەو کەسانەی زۆر خۆشەویستی نێو خەڵك بوو، دەست پاكو داوێن پاكو لێهاتووبوو.

## مەلا لەتیف بامۆکی:

ئەم پیاوە تێکۆشەرو بەتواناو لێهاتووو رۆشنبیرو نووسەر بوو، ئەندامی لیژنەی ناوچەی هەڵەبجە بوو، کۆمەڵێ سیفەتی باشی تێدا بوو بەرامبەر بە میللەتەکەی خۆی. پیاوێکی خۆش مەجلیسو قسەخۆش بوو، زۆر سیفەتی تری باشی تێدا بوو، دەستو داوێن پاكو جێگای متمانەی خەڵکی ناوچەکە بوو.

## مەلا سەعید زمناکۆیی:

ئەم پیاوە کادرێکی تێکۆشەر بوو لە ناوچەی هەڵەبجەدا. بەڕاستی لەگەڵ شۆڕشدا زۆر بەهیممەت بوو، لەناو خەڵکیشدا خۆشەویستو جێگەی راوێژ بووە.

## مەلا رەئوفی دەرویش تۆفیق:

ناسراوە بە (رەئوفی دەرویش تۆفیق). ئەم پیاوە کادرێکی تێکۆشەرو لێهاتووی هەردوو شۆڕشەکەو پێشمەرگەیەکی زۆر ئازاو لێهاتوو بوو بێ ئەوەی بیر لە هیچ شتێ بکاتەوە. بۆ بەرژەوەندیی خۆی هەموو کاتەکانی تەرخان کردبوو بۆ خزمەتی خەڵکی کوردستان لە شۆڕشی ئەیلول‌و شۆڕشی نوێدا. هەرچەندە باری ژیانی خراپ بوو، بەڵام بەردەوام بوو لەسەر خەباتی رەوای گەلەکەی دەست‌و داوێن پاك‌و بە ڕەوشت بوو خوا لێی خۆشبێ‌و سەد رەحمەت لە گۆڕی.

## مەلا عابد عەبابەیلێیی:

کادیرێکی تێکۆشەری کوردایەتی بوو، ساڵی ۱۹٦۳ لە هەڵەبجە لەلایەن جاشەکانەوە بە دیل گیرا.

ئەو کاتە ئێمە پێشمەرگە بووین لەنێو شاری هەڵەبجە، لیوای ۲۰ بە قیادەی زعیم سدیقی تاوانبار هەر چوار دەوریان گرتبووین، بەداخەوە ئەو فریا نەکەوت دەرچێ، بە دیل گرتیان، دوای ئەشکەنجەو ئازاردانێکی زۆر، بێ ئەوەی ناوی کەس بڵێ، لەبەر دەرگای سەرای هەڵەبجەدا شەهیدیان کرد. رەئوفی برای، کە برا بچووکی بوو، چوو داوای کرد جەنازەکەی بدەنەوە بۆ ئەوەی بینێژن، ئەویشیان گرت‌و کوشتیان.

کادرێکی تێکۆشەرو خۆنەویستبوو، هەموو کاتەکانی خۆی بۆ خزمەتی خەڵکی کوردستان تەرخان کردبوو. هەر لەو ساڵەدا ئێمە لە نێوشاری هەڵەبجەدا بووین، لیوای (٢٠) بە سەرکردایەتیی (زەعیم سدیق)ی تاوانبار لەگەڵ خۆفرۆشەکانیدا هاتنە نێو شارو دوای رووبەرووبوونەوەیەکی زۆر، توانییان ئەو پیاوە تێکۆشەرە بە دیل بگرن. بەڵام دوای ئەوەی نەیانتوانی هیچ زانیارییەکی لێوەربگرن‌و سوودی لێببینن، لە بەردەرکی (یانە)کەی هەڵەبجەدا، واتە لە نزیکی باخی گشتیی هەڵەبجە بە شێوەیەکی ناشیرین‌و نامرۆڤانە شەهیدیان کرد. دوای ئەوەش کۆمەڵێ خەڵك لەگەڵ براکەیدا چوون داوایان کرد، کە تەرمەکەی وەرگرنەوە بۆ ئەوەی بینێژن، پرسیانکرد کێ کەس‌و کاریەتی با بێ تەسلیمی بکەینەوە؟ لەو کاتەدا براکەی، کە ناوی (مامۆستا رەئوف) بوو رۆیشت بۆ لایان، یەکسەر ئەویشیان لە تەنیشت براکەیەوە شەهید کرد.

## خالیدی حاجی فەرەج کۆکۆیی:

بەرپرسی قوتابیان بوو. لە ساڵەکانی ١٩٥٩دا ئەم پیاوە زۆر بەتوانا بوو پێشمەرگەیەکی زۆر ئازاو خوێندکارێکی زۆر لێهاتوو بوو. بەڕاستی هەرچەند بڵێی لەبارەی ئەم تێکۆشەروە زۆر کەمە.

## عومەری حاجی سەعید:

له بنەماڵەیەکی دیاری نیشتمانپەروەر بوو، پیاوێکی زۆر دڵسۆز بوو، بۆ بەرژەوەندی میللەتەکەی زۆر قارەمان و لێوەشاوە بوو هەموو، کاتەکانی خۆی تەرخان کردبوو بۆ کوردایەتی، کادیرێکی دڵسۆزی کوردایەتی بوو. له ساڵی ١٩٦٣دا له ناوچەی نەوروۆلی لەدێی چرۆسانە مەفرەزەیەکی جاش گرتیان زۆر سزایانداو دەست و قاچیان شکاند. بە گیراوی هێنایان بۆ ناحیەی سیروان (دوجەیلە). لەبەر ئەنجامی لێدانێکی توندو تیژدا شەهید بوو. ئەو پیاوە لەگەڵ ئەو هەموو لێدان و سزایەدا هەر کۆڵی نەدەدا، بەرانبەر بە جاشەکان دەیگوت: "من کادرم خزمەتی خەڵکی کوردستان دەکەم، ئەو رۆژەی کەمن رێبازی کوردایەتیم هەڵبژارد ئەم شتانەم لەبەر چاو بوو، منەتتان نەبێ چیم لێدەکەن بیکەن." داوای ئەو ناوانەیان لێدەکرد، کە ئیشیان لەگەڵ دەکرد. ئەویش هەر دەیگوت: "ناوی کەستان پێ ناڵێم، چیتان لەدەست دێ بەرانبەرم بیکەن."

## مام عوسمان هۆمەر:

خەڵکی دێی تەپی سەفا بوو. پیاوێکی زۆر خانەدان بوو، هەمیشە له خزمەتکردنی پێشمەرگە درێغی نەکردووە.

## ئەحمەدی حەمە ساڵح:

پیاوێکی تێکۆشەرو ئەندامی لیژنەی ناوچەی هەڵەبجە بوو نەك خۆی بەڵکو هەموو خێزانەکەیان‌و ماڵەکەیان کردبوو بە دیووەخان بۆ ئەو خەڵکەی کە ئیختیفایان دەکرد. لەنێو شاردا رۆڵێکی زۆر جوامێرانەی هەبوو بۆ خزمەتی خەڵکی کوردستان هەتا ئەو رۆژەی، کە دنیای بەجێهێشت. تووشی نەخۆشی کوشندە بوو، هەموو جارێ باسی ئەوەی دەکرد، کە رزگاریی من رزگاربوونی کوردو کوردستانە، بەڵام بەداخەوە سەری نایەوەو کاتێکیش مرد، هیچیان وەکو پێویست بۆ نەکرد.

## ئەحمەدی حەمە ئەمین مەولود ئەورۆڵی:

خەڵکی بریسی سەروو بوو، ئەم پیاوە زۆر تێکۆشەرو ناسراوی ناوچەکەیە زۆر خزمەتی پێشمەرگەو کادرەکانی شۆڕشی میللەتەکەمانی کردووەو قەد سەریشی بۆ دوژمن شۆڕ نەکردووە، تاکە پیاو بوو لەو ناوچەیە چەندەها جار حوکمەت زەختی خستە سەر کەچەك هەڵگرێ بۆیان بەپارەو بەچەك ئیغرایان دەکردو بەڵام ملی نەئەدا بەهیچ لایەك هەر بەردەوام بوو لەسەر گرتنی رێبازی پیرۆزی کوردایەتی وازی لە هەموو بەرژەوەندیەکی خۆی‌و ماڵ‌و منداڵی هێنا بوو لە پێناو بەرژەوەندی راستەقینەی گەلی کوردستاندا، ئەوە بوو عبدالوهاب ئەتروشی چەند جارێك گرتی‌و سجنیان کرد وە زۆر

عەزێتیان ئەدا بەڵام ئەو خاوەنی هەڵوێستێکی شەریفانە بوو پاشان عبد الوهاب ناردیە سەری بۆ ماڵەوەو شەهیدیان کرد لەگەڵ هەندێك لە منداڵەکانیدا.

## سەعدی بەگی تەوێڵەیی:

بەڕاستی ئەم پیاوە نموونەی شەهامەتو پیاوەتی بوو، لە پێناوی بەرژەوەندی ڕاستەقینەی میللەتەکەیدا لە ساڵانی ۱۹٦۳ چەند جارێك لە لایەن عبدالوەهابەوە گیراوەو ناردوویانە بۆ ماوەت، سزایەکی زۆریان دا، بەڵام ئەم پیاوە هەربەردەوام بوو لەسەر ڕێبازی پیرۆزی ڕاستەقینەی کوردایەتی، ماڵیان لە تەوێڵە بوو جاری وا هەبوو (۳) سێ مانگ لە ماڵ نەدەهاتە دەرەوە بۆ ئەوەی ئیهانە نەکرێت، یان قسەی ناشرین لە ڕوویا نەکرێت تەحەمولی هەموو ئەرك‌و ئازارێکی دەکرد لە پێناوی مافی ڕەوای گەلەکەیدا، بەڕاستی جێگەی فەخرو شانازی بوو بۆ خەڵکی کوردستان بەڵام بەداخەوە ئەویش هەروا سەری نایەوە.

## حەزەی مامە خان:

پیاوێکی نیشتمان پەروەر بوو هەموو کاتەکانی خۆی تەرخان کردبوو، لە بارەگاکانی کوردایەتی‌دا بۆ خزمەت کردنی پێشمەرگەو کادرەکانی ڕێبازی کوردایەتی بەبێ بەرانبەر وەهەر بەو ئاواتەوە سەری نایەوە.

## نوری حەمەی ئانەوا:

لەساڵەکانی ١٩٥٤دەوە بەردەوام بوو لەسەر ڕێبازی کوردایەتی. پیاوێکی زۆر دڵسۆزو بەتواناو تێکۆشەر بوو، لە ساڵی ١٩٥٩ ئەندامی لیژنەی ناوچەی هەڵەبجە بوو، لە ئیش و کارەکانیا زۆر سەرکەوتوو بوو لە ساڵی ١٩٦٠ دا لەسەر چالاکی و وەفاداری بۆ کورد چوونە سەری بۆ دوکانەکەی خۆی دوو خەنجەرایان لێ دا بەڵام بە ڕێکەوت لە مردن ڕزگاری بوو. دوای عیلاجێکی زۆر ئەو برادەرە هەر بەردەوام بوو. لەسەر ڕێبازی کوردایەتی، تاکو بەو ئاواتەوە سەری نایەوە خواڵێی خۆش بێت بەڕاستی نموونەی ئەخلاق و پیاوەتی بوو.

## شێخ سەعیدی موفتی:

پیاوێکی زۆر تێکۆشەرو دڵسۆز بوو بەرانبەر بە میللەتەکەی، هەموو تەمەنی گەنجیی خۆی لەپێناوی ئاوات و ئامانجی نەتەوەکەیدا بەسەر برد. لە بنەماڵەیەکی ئایینی خەڵکی هەڵەبجەن ماوەیەکی زۆر بەرپرسی لیژنەی ناوچەی هەڵەبجە بوو. زۆر بە ڕێك و پێکی ئیشەکانی خۆی بەرێوە دەبردو پیاوێکی دەست پاك و داوێن پاك بوو.

## شێخ عەلی شێخ کەریم عەبابەیلێی:

پیاوێکی تێکۆشەرو ماندوونەناس بوو. یەکرێ لەگەڵ شۆڕشدا هاتو سەبرو تەحەمولی هەموو شتێکی کرد. ئەم پیاوە کارمەندی حکومەت بوو، وازی لە هەموو مووچەو سەروەتو سامانو خۆشگوزەرانی خۆی هێنا بۆ کورد.

## ئەفراسیاب بەگی ئەحمەد بەگی جاف:

لە ساڵی ١٩٥٤دا لەگەڵ خوالێخۆشبوو کاك (نوری ئەحمەدی تەها) خۆیان پاڵاوت بۆ ئەندامی پەرلەمانی عیراق لە هەڵەبجە. ئەو کاتە لە عیراقدا نیمچە ژیانێکی دیموکراسی پەیڕەو دەکرا. هەر چەندە دەسەڵاتدارانی میری هەمیشە بەلای ئەو کەسانەدا دایاندەتاشی، کە سەر بە خۆیان بوون، بەڵام ئەم دوو خوالێخۆشبووە لەلایەن جەماوەرەوە خۆشەویست بوونو دەنگیان بۆ درا. دەرەنجام هەر نوێنەری میری دەرچوو. من لێرەدا باسی ئەو بەڕێزانەم کردووەو بە ویژدانەوە لە هەڵوێستیان دواوم، چونکە لەو سەردەمانەدا کەسانی وا کەم بوون، کەسانێکی چینەکانی خوارەوە هەبوون، کە خۆیان کردبوو بە داردەستی دەستەڵاتدارانو پشتیان لە شۆڕشی رزگاریو ئازادیخوازی میللەتەکەمان کردبوو.

## حاجی ئەوڵەی ئەسە تەویلەیی:

پیاوێکی زۆر تێکۆشەرو کورد پەروەر بوو خاوەنی هیچ نەبوو بەرانبەر بە شۆڕشی گەلی کوردو وەزعی ژیانی زۆر باش بوو ئەو کاتە تفەنگێکی بڕنەوی دا پێمان بۆ بەرگری کردن لە حەقی ڕەوای گەلەکەمان، پیاوێکی ناودارو بە توانا بوو لە هەموو بوارەکاندا، زۆر جار ئەیووت کەی بێت ئەم کوردستانە بە ئازادی ببینین، بەڵام بەداخەوە بەو ئاواتەوە سەری نایەوە.

## سالح عەبدوڵلا بامۆکی:

پێشمەرگەیەکی دلێرو لێهاتوو بوو لە نەتیجەی ئازایەتیو لێوەشاوەیی خۆی ساڵی ١٩٦٣ بوو بە سەرپەل لە لقی بیارە، بەڕاستی زۆر بەتواناو تێکۆشەر بوو هیچ سڵی لە دوژمن نەدەکردەوە هەموو کاتێك بیری لەوە دەکردەوە چۆن دەست لە دوژمن بوەشێنێ، بەڵام بەداخەوە ئەویش ئاواتەکانی بردە ژێر گڵ.

## عەبدوڵلای مەلا ئەمین:

ئەندامی لیژنەی جوتیارانی هەڵەبجەو دەوروبەری بەڕاستی پیاوێکی زۆر قارەمانو تێکۆشەر بوو بۆ خزمەتکردن لەپێناوی بەرژەوەندی خەڵکی کوردستان، ئەم پیاوە هەر کاتێك ئیشێکت پێ بسپاردایە شەو

یان ڕۆژ زۆر بەرێك‌و پێكی ئەچوو بەپیر ئەو ئیش‌و كارانەوەو وازی لە هەموو خێرو خۆشی هێنابوو بۆ بەرژەوەندی خەڵكی كوردستان، زۆر بەداخەوە لە ساڵی ١٩٧٤ لە ئەنجامی قەسف كردنی شاری هەڵەبجە لەلایەن فرۆكەكانی بەعسەوە شەهید كرا.

**فرەج هەورامی:**

یەكێ بوو لە پێشمەرگە قارەمانەكانی ڕۆژانی سەخت‌و لێقەومان. بەڵام سەیر لەوەدا بوو، ئەگەر شەڕ بوایە بەسەردەكرایەوە، بەڵام ئەگەر ئاشتی بوایە كەس گوێی لێ نەدەگرت. ساڵی ١٩٩٤ لەگەڵ شەهیدی نەمر كاك (قادر كۆكۆیی) هاتن بۆ ماڵەوە بۆلام، زۆر گلەییان دەكرد لە هەندێ لە كاربەدەستان وەكو پێویست هیچ شتێكیان بۆ ناكەن، نەوەك بەرپرسیاری، نەوەكو ژیان، نەوەك یارمەتی، زۆر دلگران بوون، پێیان گوتم بەڵكو بە (مام جەلال) بڵێیت بۆچی لە ڕۆژە ڕەشەكاندا ئێمە سەركردەین‌و تێكۆشەرین، بەڵام لە ئاشتیدا هیچ حسابێكمان بۆ ناكەن. منیش زۆر (دڵخۆشیم كردن) پێم گوتن: ئەم شۆڕشە شۆڕشی خۆمانە، بە ڕەغمی هەموو كەم‌و كوڕیەك نابێ كۆڵ بدەین، بەڵام بەداخەوە ئەوە بوو لەدوای چەند مانگێ لە شەڕێكی بەرانبەردا هەردووكیان شەهید كران زۆر بەداخەوە ئەو برادەرەو چەندەهای تر بەوەدەردەوە سەریان نایەوە.

## عیزەت حەمە سەعید تەوێڵەیی:

پیاوێکی زۆر دڵسۆزو تێکۆشەر بوو، هەموو کاتەکانی خۆی تەرخان کرد بوو بۆ خزمەتی گەلەکەی هەر لەساڵەکانی ١٩٦٠ەوە بەچەکی خۆیەوە لە تەوێڵە خەریکی کاری ڕێکخستن‌و پێشمەرگایەتی بوو، بەڕاستی خاوەنی تەقدیرو ڕێزێکی زۆر بوو لەناو خەڵکی هەورامان‌و ناوچەکانی تری کوردستاندا.

## عەبەی خاڵێ:

ئەوەندەی من ئەو پیاوەم ناسیبێ خاوەنی هەڵوێستێکی باش بووەو هیچ شتێ کاری تێنەکردووە، کە ڕێبازی کوردایەتی بەجێ بهێڵێ لە هەمو کات‌و زروفێکدا هەر پشتگیری لە کوردو شۆڕش ی کورد کردووە چەندین جار ئەم پیاوە قارەمانە تووشی کێشەو نارەحەتی بووە لەگەڵ خۆفرۆشان لە پێناوی شۆڕشی کوردستاندا، ئاوات‌و ئامانجی ئەم پیاوە ڕزگاری کوردو کوردستان بوو بەڵام بەداخەوە بێ بەش بوو لە هەموو خێرو خۆشیەکی ڕزگاری گەلەکەمان.

## حەمە ڕشید ئەولی محەمەدی گردی گۆ:

پیاوێکی ناودارو تێکۆشەر بوو لە هەموو کاتە ناتەواوەکانی ساڵی ١٩٦٣ ئەو کاتە ئێمە بۆ ماوەی (٣) سێ مانگ لەچەمی زەڵم دا ڕێمان گرت لە

جەیش‌و جاش، چەند جارێك حكومەت هێرشی بەربلاوی ئەكردە سەرمان بۆ كردنەوەی ڕێگەكە، بەڵام ئەشكان هەردوای ئەوەی جەیش‌و جاشەكان ئەگەڕانەوە خەڵكی ئەو چەند دێیەی دەوروبەری زەڵم بەنان‌و دۆو چاوە ئەگەیشتنە سەرمان. بەڕاستی زۆربەی زۆری ئەركمان لە سەرماڵی خوالێخۆشبوو كاك حەمە ڕشید ئەولێ محەمەد بوو، بەبێ ئەوەی ناوچەوانمان لێ گرژ بكا بەخۆی‌و ماڵ‌و منالێیەوە یارمەتیان دەداین.

## حەمەی هەواس ئێناخی:

هەتا بلێی پیاوێكی بە تواناو لێوەشاوە بوو سەرپەلی (٣) سێ بوو لە لقی بیارە، پیاوێكی خۆشەویست بوو لەناو خەڵكدا لە ڕۆژانی تەنگانەدا زۆر بەهیمەت بوو.

## غەریب عەبدولقادر:

لێپرسراوی جوتیارانی هەڵەبجە پیاوێكی زۆر تێكۆشەرو نیشتمان پەروەر بوو بەڕاستی نموونەی پیاوەتی‌و شەهامەت بوو وە هەمیشە ماڵەكەیان جێگەی كۆبوونەوەو وتووێژ بوو بۆ جوتیارانی هەڵەبجەو ناوچەكە.

## ئەحمەدی عەول کریم:

لەسەرەتای ژیانی کادرێکی چالاکی کوردایەتی بووە بەبێ دوودڵیو کەمتەر خەمی، زۆر جار تووشی چەندەها کێشە بووە لەسەر ڕێبازی کوردایەتی بەڵام ئەم پیاوە قارەمانە هەر بەردەوام بوو لە خەباتی خۆیدا بەداخەوە لە ساڵی ١٩٨٨ لەهەڵەبجەی شەهید خۆیو خێزانیو چوار منالی بەچەکی کیمیاوی لەناو چوون.

## ڕەئوف مستەفا بەگی قلیجە:

پیاوێکی زۆر ئازاو تێکۆشەر بوو، لەساڵەکانی ١٩٦٠ەوە یەك ڕێ لەگەڵ ڕێبازی کوردایەتی‌دا هاتووە بێ لادان ئەو پیاوە بەبنەماڵە تێکۆشەر بوو تووشی هەزارو یەك دەردی سەری بوون لە پێناوی بەرژەوەندی خەڵکی کوردستان دا. پیاوێکی دەست پاكو داوێن پاك بوو لەکاتی شەڕیشدا خاوەن هەڵوێستێکی قارەمانانە بوو.

## کوێخا عبداللەی کۆیی:

پیاوێکی زۆر تێکۆشەر بووە لە ساڵەکانی ١٩٥٩ەوە هەموو وەختی خۆی تەرخان کردووە بۆ خزمەتی کوردو شۆڕشەکەی لەهەر کاتێکدا پێی کرابێت بەهەموو تواناوە ئیشو کاری ڕێكو پێکی کردووە بۆ خزمەتی میللەتەکەی، ماڵەکەشی دیووە خانی پێشمەرگە بووە، خۆی بەخاوەنی

هیچ نەدەزانیو بەچەکی خۆیەوە بووە بە پێشمەرگە بەبێ مقابیل، هەروەها زۆر بەتەنگ دۆستو هاوڕێکانییەوە بووە لە ڕۆژە ڕەشەکاندا.

## ئەنوەر بەگی جاف:

ئەم پیاوە پارێزەرو خوێندەوار بوو، دۆستێکی نزیکی خوالێخۆشبوو مامۆستا (ئیبراهیم ئەحمەد) بوو، زۆربەی پیاوە سیاسییەکانی کورد سەردانو دیدەنیان دەکرد، ئەویش بەپێی توانا یارمەتی ئەدان. ئەم پیاوە هەر چەند خاوەن موڵك بوو، بەلام زۆر ئیشو کاری باشی دەکرد. هەرکاتێ خوالێخۆشبوو مامۆستا (ئیبراهیم ئەحمەد) سەردانی هەڵەبجەی بکردایە لە ماڵی ئەوان میوان دەبوو.

## مەلا حسێن کۆکۆیی:

ئامۆزای قادر کۆکۆیی بوو. پیاوێکی زۆر تێکۆشەرو ئازاو بەجەرگ بوو زۆر عاقڵو لەسەر خۆ بوو، بیرم دێت زۆر جار بۆ پێشمەرگەکانی باس دەکرد کە دەچنە ماڵان زۆر ڕێكو پێكو لەسەر خۆ بن لەقسەکردن دا.

## ئەحمەد عەبدوڵلا کوردە:

ناسراو بە ئەحە سمێڵ لە عەشرەتی میراڵەیی: پیاوێکی زۆر تێکۆشەرو دڵسۆز بوو لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلول تا ساڵەکانی ١٩٦١ بەچەکی

خۆیەوە بوو بە پێشمەرگە وە سەیارەیەکی جێبی هەبوو تەرخانی کردبوو بۆ کاروباری ڕێکخستن‌و پێشمەرگایەتی. بەڕاستی ئەم پیاوە ئەوەندەی من دەیناسم لەکاتی شەڕداو لە ڕۆژە شوومەکانی لێ قەوماندا خاوەنی هەڵوێستێکی پیاوانە بوو لە بەرەکاندا بۆیە بە ئاسانی دوژمن نەیدەتوانی ڕووی تێ بکات، لەگەرمەی شەڕدا هۆرەی دەکردو وورەی پێشمەرگەی بەرزدەکردەوە وەهەروەها ساڵی ١٩٨٢ بەیەکەوە گیراین لە لایەن بەعسەوە لە سلەیمانی لەگەڵ ئازاردان‌و ئەشکەنجەیەکی زۆردا ڕۆژبە ڕۆژ ئەم پیاوە زیاتر مەعنەویاتی بەهێز دەبوو لەگەڵ ئەو وەزعە ناخۆشەی کە بەسەرمان دەبرد لەگرتوخانە بەدەستی کەلەبچەو چاوی بەستراوەوە ڕۆژانە ئەیان بردین بۆ ئەشکەنجەو ئازار، ئەم پیاوە بەهیچ جۆرێك تەنازلی نەدەکرد.

## حەمەی ڕەشە قۆڵچی:

زۆر بە تواناو هەڵکەوتوو بوو، هیواو ئاواتی ڕزگاری‌و دۆستایەتی بوو لەناو خەڵکدا کاتێك کە گیرا بەعەسکەر دوای ماوەیەك ڕای کردو هاتەوە بۆ هەڵەبجەی شەهید لەڕێگە گرتیان ماوەیەکی زۆر لە سجن مایەوە جارێکی تر لەسجن ڕای کرد، ئەم پیاوە قارەمانە بەدەمانچەیەکەوە لەدەوروبەری هەڵەبجە لە ساڵانی ١٩٥٦، ١٩٥٧ دابێ سڵ کردنەوە لە حکومەت لەزۆر شوێن ئەبینرا پۆلیسەکانیش لە ترسا

خۆیان لیٚ لائه‌دا هەرچەنده باسی بکەیت له هەموو رووییەکەوه زۆر لیٚهاتوو بوو بەلاّم بەداخەوه بەدەستی دۆستیٚکی ناپاکی خۆی لەناکاو دایان بەسەریاو شەهیدیان کرد لەگەڕەکی کانی عاشقان زۆر بەداخەوه ئەم کوڕه ئازایه چاوەڕوانی شتی چاکی لیٚ دەکرا بۆ خزمەتی خەلّکی کوردستان.

## دلیٚر جاف:

پیٚشمەرگەیەکی قارەمانو تیٚکۆشەر بوو. بەراستی له کاتی شەڕو پیٚکداداندا زۆر قارەمانو بەتوانا بوو، چەند جاریٚ ریٚم کەوتۆته مالّیان، ئەوان خاوەنی هیچ نەبوون بەرامبەر شۆڕشو پیٚشمەرگەی کوردستان.

پیاویٚکی زۆر تیٚکۆشەرو لیٚهاتوو بوو بەهەموو مانای ووشه که پیٚشمەرگه بوو لەو ڕۆژانەی که زۆرمان بۆ دەهات شەهیدی نەمر دەکرا به بەرپرسی بەره بەلاّم به داخەوه ئەویش وەکو شەهیدی نەمر قادر کۆکۆیی کەوەزعەکه ئارام دەبوەوه ئەیان ووت توانای بەرپرسییان نیيه هەندیٚ لەو برادەره بیٚ ویژدانانه، کاك دلیٚر هەتا شەهید بوو هیچ توانایەکی مادی نەبوو کەپیٚی بژی وەهیچ بیریٚکی لەبەرژەوەندی تایبەتی نەدەکردەوه جگه له دانانی بۆسه بۆ دوژمن وەلیٚدانیان به

داخەوە تا شەهید بوونی زۆر دەستی کورت بوو، وهیچ حسابێکی بۆ نەکراوە وەکو پێویست.

## عوسمان عەلی حاجی ساڵح:

ئەندامێکی دڵسۆزی شۆڕشی گەلەکەمان بوو پیاوێکی نەبەز بوو زۆر هیلاك بوو لە پێناوی بەرژەوەندی خەڵکی کوردستاندا زۆر بەداخەوە ساڵی ١٩٨٧ لە خۆپیشان دانەکەی هەڵەبجەدا بەئەسیری لەگەڕەکی کانی عاشقان لە ماڵی خۆیدا بەبریندارێ دەستگیر کرا لەلایەن جەلادەکانی بەعسەوە، برینەکەی سووك بوو بەڵام بەداخەوە خۆی‌و چەند کەسێکی تر لەبەردەم کانی شێخی بامۆك هەر بە زیندویی کردنیان بەژێر خۆڵەوە وەهەروەها گەڕەکی کانی عاشقان زیاتر لە سێ سەد ماڵ دەبوو هەموویان تێکوپێك دا بەسەر دانیشتووە هەژارو بێ دیفاعەکاندا بێ ئەوەی دەست لەژن‌و مناڵ‌و پیر بپارێزن زۆر بەداخەوە.

## حاجی ساڵحی گێڵەك:

پیاوێکی زۆر دڵسۆزو لێوەشاوە بوو خاوەن هەڵوێستێکی کوردایەتی بوو ماڵیان لە گوندی (گێڵەك) بوو، ئاشێکی هەبوو لە نزیك جادەی پردی زەڵم (ئاشی ئارد). هەر دەنگوباسێکیان ببیستایە یەکسەر خەڵکی دەناردوو ئاگاداریان دەکردین لە جمووجووڵی میری. زۆر جار دەهاتە

لامان دڵخۆشی دەکردین، پێی دەگوتین زۆر ئاگاتان له خۆتان بێ، ئەزانم ئێوه له مردن ناترسن، بەڵام ئەمە جێگای شەڕ نییەو زۆر وورپابن. گۆمەڵێ قسەی دۆستانەی بۆ دەکردین، ئێمەش قسەکانیمان قبوڵ بووو به دۆستێکی خۆشەویستمان دەزانی، بەڵام دەمانگوت به هەموو توانامان هەوڵ دەدەمین نەهێڵین دوژمن له پردی زەڵم بپەڕێتەوه بەرەو هەڵەبجەو خورماڵ. ئەویش دەیگوت منیش شەوو رۆژ دۆعای خێرم له سەره بۆتان بکەم.

## حاجی موشیر کۆکۆیی:

له ساڵەکانی ١٩٥٩ وەکو دۆستێکی حیزبی پەیوەندی کردووه بەپارتی دیموکراتی کوردستانی ئەو کاتەوه، پیاوێکی زۆر ناسراوو بەوەفا بووه، وەزعی ژیانیشی زۆر باش بووه له ساڵەکانی ١٩٦٤ بووه به پێشمەرگه لای ئێمه. به حوکمی لێهاتوویی خۆی کراوه بەسەرپەل له لقی (٣) ی بیاره. ئەو پیاوه دەورێکی زۆر باڵای هەبووه له شەڕی ناوچەکەدا، پیاوێکی دەست پاك‌و داوێن پاك‌و قسه خۆش بووه.

## مستەفای حاجی فرج تەوێڵەیی:

پیاوێکی زۆر دڵسۆزو تێکۆشەر بوو، ماڵەکەی جێگەی حەوانەوەی پێشمەرگەو کادرەکانی کوردایەتی بوو، هەر کاتێ بچوویتایه ماڵەکەی

خۆی بەخاوەن ماڵ نەدەزانی هەر بەبنەماڵە تێکۆشەر بوون لە ڕێگای کوردایەتی‌دا.

## عەبدوڵڵای مەلا عەلی هەڵەبجەیی:

کادێرێکی تێکۆشەرو دڵسۆزبوو. بەداخەوە ئەم ئازادییەی نەبینی، کە هەمیشە خەونی پێوە دەبینی.

## حەمە نوری حاجی ئەمین:

پیاوێکی ناسراوی هەڵەبجە بوو، لە بنەماڵەیەکی شۆڕش گێڕو نیشتمان پەروەر بوو، پیاوێکی زۆر عاقڵو لەسەر خۆ بوو، کادرێکی دڵسۆزی کوردایەتی بوو، لەناو خەڵکیدا زۆر ڕێزی لێ دەگیرا ئاواتو ئامانجی ڕزگاری خەڵکی کوردستان بوو، تووشی چەندەها ئازارو ناڕەحەتی بوو لەو ڕێبازەدا، بەڵام هەر کۆڵی نەدا تا شەهید بوو.

## حاجی ئەولکەریم:

لە دێی شیرەمەڕ بوو. پیاوێکی زۆر تێکۆشەر بوو، زۆربەی ئیش‌و کارەکانمان لە ڕێگەی ئەوەوە دەکرا وەهەروەها گواستنەوەمان لەدێیەك بۆ دێیەکی تر.

## حاجی عەبدوڵڵای کەلۆش:

پیاوێکی زۆر جوامێرو لێهاتوو دڵسۆز بوو بۆ شۆڕشی گەلەکەمان هەر لەساڵەکانی ١٩٦٠ هەتا شەهید بوونی خاوەنی ڕێزو ئیحترام بووە لەناو خەڵکی ناوچەکەدا. ئەم پیاوە وەزعی ژیانی باش بوو وە قەد درێخی نەکردووە لە خزمەت کردنی پێشمەرگە بەخۆیو براو کەسو کاریەوە.

## عەلی حاجی فەرەج:

دوو سێ وەکالەتی هەبوو، ژیانو گوزەرانی باشبوو. جاشەکانی نێوشار، زۆر جار بۆ ئەوەی دوکانی خەڵك تالان بکەن دەیانکرد بە تەقە لەنێو شاردا، ئەو دوکانانەی کەوا هەندێ شتی بەنرخی تیابووایە کاتێ خاوەنەکانیان ناچار دەبوون رابکەن، ئەوان دەچوون تالانیان دەکرد. یەکێ لەوانە دوکانی ئەم پیاوە بوو. دەیانگێڕایەوە لە نێوان خێزانی دوو بنەماڵەی جاشدا بووە بەشەڕ. لە سەر دابەشکردنی سەعاتی دوکانەکەی، ماڵێکیان بە ناوی (سەعەی سلێمان)ەوە گوتبووی:

"نەنکم سەعاتی بەرنەکەوتووە."

ئەمانەو شتیتری لەم شێوەیە، کە لەلایەن چەند پیاو خراپێکەوە لە نێو شاری هەڵەبجەدا ئەنجام دەدرا.

## محەمەد ئەمین مام کریم:

خەڵکی ناوچەی دوکان، پیاوێکی فەرماندەو لێهاتوو دڵسۆز بوو، لە ساڵی ١٩٦٠ لەگەڵ ڕێبازی کوردایەتی‌دا بووە چ وەك ڕێکخستن چ وەك فەرماندە. زۆر پیاوێکی ڕوو خۆش‌و قسە خۆش بوو لەناو خەڵکیدا ئەوەندەی من ناسیبێتم کەس گلەیی لێ نەبووە.

## مەحمود بەگی حسێن بەگ:

پیاوێکی ناوداری هەڵەبجە بوو، چەند جارێ لەلایەن حکومەتەوە داوای لێکرا هاوکارییان بکا بۆ ئەوەی کۆمەڵێ چەکداری هەبێ، بەڵام ئەو هیچی قبوڵ نەکرد. چەند جارێ بۆی باس کردم دەیگوت:

"من ئەگەر بارو گوزەرانیشم زۆر خراپ بێ، ئەوا هەر ئامادەنیم خیانەت لە کوردو کوردستان بکەم."

## مەحمود بەگی ئەوڕەحمان ئەفەنی:

دانیشتووی شاری هەڵەبجە بوو، خاوەنی زیاتر لە (٧٠) دوکان بووە لە نێو هەڵەبجەدا. کاتێ کرێی دوکانەکانی وەردەگرت، دابەشی دەکرد بە سەر لیقەوماوانو هەژاراندا، خۆیشی مانگی وا هەبوو لە ناوەڕاستی مانگەکەدا قەرزی دەکرد. ئەم پیاوە سەڵت بوو، زۆری پێ‌خۆش بوو خزمەتی جەماوەر بکا، بەداخەوە ساڵی ١٩٧٤ لە هێرشەکەی شاری

هەڵەبجەدا خۆیو خزمو کەسو کارەکانی لەناو خانووەکەدا بەر ناپاڵم کەوتنو هەموویان شەهید بوون.

## حسن بەگی عەلی بەگی جاف:

ئەم پیاوە لە بەگزادە ناودارەکانی ئێلی جاف بوو، لە زەمانی پاشایەتیدا ئەندامی پەرلەمان بوو، خاوەنی (٧٠) دێ بوو، هەر لە ناوچەی (جەلەولا)وە بگرە تا (شارەزوور) گوندی هەبوو. جگە لەوە شاعیرو نووسەریش بوو.

## مولازم عوسمان سەعید بەگ:

مرۆژێکی زۆر قارەمانو بە توانا بوو. ماوەیەکی زۆر پێکەوە بووین لە رۆژە ناخۆشەکانداو هاوڕێی یەکتر بووین. لە مانگی دوانزەی ساڵی ١٩٧٤دا وەکو سەرلق لەگەڵ مندا بوو لە شەڕەکانی سەرتیزو بێشێ.

## حامید حەمە تایەر بەگ:

لە ساڵەکانی ١٩٦١ لەلایەن میریەوە بڕیاری گرتنی دەرچوو بوو لەبەر ئەوەی پیاوێکی نیشتمان پەروەر بوو سڵی لە هیچ کەلو کۆسپێك نەدەکردەوە لە پێناوی بەرژەوەندی میللەتەکەیدا من ئەم شاهیدیە

ئەدەم بۆ ئەوانەی کەناوم نوسیون کە خاوەنی خەباتێکی بێ ووچان بوون لە رۆژە رەشەکاندا.

## مستەفا کۆکۆیی:

پیاوێکی زۆر بەحورمەتو ئازاو لێوەشاوە بوو بەشداری زۆر شەڕی سەختی کردووە لەگەڵ دوژمنانی شۆڕشی گەلەکەمان.

## قادر کۆکۆیی:

یەکێ بوو لە قارەمانانی شۆڕشی سەرەتایی، کە لە هەموو شەڕو پێکدانێکدا هەرگیز سڵی لە دوژمن نەکردۆتەوە. پێنج جار بە سەختی بریندار بوو. هەر کاتێ، ئەگەر شەڕێکی قورس بووایە، بەرپرسیان داوەتێ. بەڵام ئەگەر ئاشتی بووایە، پشتگوێ دەخرا. ئەمەی چەند جار لای من باس دەکرد، بەتایبەتی لەم دواییەدا. ئەوە بوو، لە شەڕێکی بەرانبەردا خۆیو کوڕەکەی شەهید کران لە نزیك سید سادق. کاك قادر وەك بنەماڵە خاوەنی خەباتێکی دوورو درێژەو چەندین کەس لە بنەماڵەکەیان شەهید کراون، وەك براو ئامۆزاو خزمو کەسو کاری.

## شێخ حهمه ئهمینی شێخ مستهفا عهبابهیلیی:

پیاوێکی زۆر تێکۆشهرو لێهاتوو بوو له ساڵهکانی ۱۹۵۹ ئهندامی لیژنهی جوتیاران بووه کاری زۆر چاكو ڕێكو پێکی ئهنجام داوه بۆ بهرژهوهندی خهڵکی کوردستان له ههموو بوارهکاندا. ئهم پیاوه برای شههیدهو کوڕی شههیده زۆر هیلاك بووه لهگهڵ شۆڕشی گهلهکهماندا تاکو ئێستا ئهویش‌و حاجی مشیری کۆکۆیش له جێگادا کهوتوون‌و وهزعی ژیانیان خراپهو هیچ شتێکی وایان بۆ نهکردوون بۆ ئهوهی پیِ‌ی بژین ئهم پیاوه ناودارانه که باسم کردن به حهقی خۆمی دهزانم چونکه مێژوو شاهیده که چ دهورێکیان ههبووه له شۆڕشی گهلی کوردستاندا. زۆر پیاوی چاكو ههڵوێستی کوردانهم دیوه له ناوچه جۆراو جۆرهکانی کوردستان که ناتوانم ناوی ههموویان بنووسم چونکه بهڕاستی ههندێك لهمانه زۆر هیلاك بوون‌و لهگهڵ ئهرك‌و ئازاری میلهتهکهماندا بوون لهوانه:

## مستهفا ئهفهندی:

له خورماڵ دادهنیشت. ئێمه، که پێشمهرگه بووین، ههرچهنده له سهرهتادا گلهییمان لێی ههبوو، بهڵام ئهو خۆی زۆر له ئێمه نزیك دهکردهوه. هاتووچۆی (سلێمانی – سید سادق)ی دهکرد. ڕۆژێ هاته لامان، گوتی زۆر ئاگاتان له خۆتان بێ، حکومهت دهیهوێ به ههموو

شێوەیەك بگەڕێتەوە بۆ هەڵەبجە. ئەو کاتە هەڵەبجە بەشی ئیدارەی تیا بوو عەسکەری تیانەبوو. ئێمەش تاکو رادەیەك گوێمان لێ دەگرت. ئەم پیاوە دوای ماوەیەك تفەنگێکی بڕنەوی هەبوو ناردی بۆمان، گوتی: "با لاتان بێ، بەڵام لای کەس باسم مەکەن." بەوە ئەم پیاوە زۆر لێمان نزیك بووەوەو دەرکەوت پیاوێکی باشە. زۆر زانیاری راستی بۆ دەهێناین. لەم شۆڕشە نوێیەشدا دوو کوڕیو دوو برازای شەهید بوون. ئەو کاتەی ئەو تفەنگەی بە ئێمەدا، بۆ ئێمە شتێکی زۆر بوو، چونکە ئێمە چەکەکانمان هۆڵندیو ئینگلیزی بوو لەگەڵ پێنج تیر.

## حاجی عەلی کەڵوڕ:

یەکێ بوو لەو پیاوە دڵسۆزانەی، کە پێی لێ نەدەبڕین. کە رومان دەکردە ماڵەکەی بەرەو پیرمان دەهات. زۆر جاریش، ئەگەر دەنگوباسێکیان بزانیایە لە لایەن پیاو خراپانەوە، زوو ئاگاداریان دەکردین بۆ ئەوەی وریای خۆمان بین.

## حاجی حەمە عەلی تەپەتۆڵەکە:

خۆیو خێزانەکەی زۆری یارمەتی دەداین لە کاتی لێ قەوماندا بە وولاخو تراکتۆر نانو ئاویان فریا دەخستینو سەردانیان دەکردین بۆ سەنگەرەکانمان.

## حەمەی ئەورەحمان ئاغا:

بەڕاستی ئەم پیاوەش خاوەنی هەڵوێستێکی کوردایەتی بوو، بە هیچ جۆرێ سازش‌و سەری بۆ دوژمنانی کورد دانەنەواند.

## حاجی حەمە ئەمینی حامید:

لە دێی (جانجان)ی سەر بە ناحیەی سیروان بوو. پیاوێکی زۆر خەمخۆرو دڵسۆز بوو بۆ پێشمەرگە، زۆر دڵنەوایی دەکردین‌و یارمەتی دەداین.

## مەلا رەئوفی دەرویش تۆفیق:

یەکێ بوو لە کادرە تێکۆشەرەکانی کوردایەتی هەر لە تەمەنی منداڵیەوە دەست بەکار بووە لە ڕێکخستنی قوتابیان‌و لەگەڵ شەهیدی نەمر خالدی حاجی فەرج‌و چەندین برادەری بە ئەمەك. کاك مەلا رەئوف خاوەنی خەباتێکی دوروو درێژ بوو. تووشی گەلێ چەرمەسەری‌و نارەحەتی‌و ئازارو ئەشکەنجەو دەربەدەری بووە لە ڕێگای کوردایەتی‌داو پیاوێکی زۆر بە هەڵوێست‌و کۆڵنەدەر بوو، سڵی لە دوژمنانی شۆڕشی کورد نەدەکردەوە. چەندین کاری پێشمەرگایەتیی ناوخۆشی بێ سڵکردنەوە جێبەجێ کردووە. زۆربە داخەوە ئەو هەڤاڵە

لەم دواییەدا زۆر دەستی کورت بوو، ژیانی مادیی باش نەبوو تا بە نەخۆشی کۆچی دوایی کرد.

## رەئوفی حاجی حەمە عەلی:

مامۆستای کوردایەتی مامۆستا رۆوف لەساڵەکانی ١٩٥٥، ١٩٥٦ کاری کوردایەتی دەکرد. پیاوێکی زۆر دڵسۆزو بەتواناو تێکۆشەر بوو، وەزعی ژیانیان زۆر باش بوو، بێ سڵ کردنەوە لەبەرژەوەندی خۆیو بنەماڵەکەیانو سلکردنەوە لە دوژمنی گەلی کورد ئەم پیاوە هەر بەردەوام بوو لەسەر رێبازی کوردایەتی لەدوای شۆڕشی ١٤ ی تەموزی ١٩٥٨ دەستێکی باڵای هەبوو لە رێکخستنو دروست کردنی تەنزیم ی کوردایەتی ماوەیەك بەرپرسی لیژنەی ناوچەی هەڵەبجە بوو، کاری زۆر چاکی دەکرد، پیاوێکی دەست پاكو دڵ پاك بوو، ئەویش هەر بەو ئاواتەوە سەری نایەوە، بەداخەوە هیچ گۆڕانکاریەکی چاکی نەدی لەناو بزوتنەوەی کوردایەتیدا لەوکاتەدا.

## رەئوف بەگی قلیجە:

کادرێکی ماندویی نەناسی تێکۆشەری عەسکەریو سیاسی بوو. ئەم مرۆڤە زۆر لە ئەندامانی بنەماڵەکەشی شەهید کراون لە پێناوی ئازادیو رزگاریی خەڵکی کوردستاندا.

حەمەی فەرەج لە کۆنگرەی دووەمی ی.ن.ك لە ساڵی ٢٠٠١ لە شاری سلێمانی

# گلەیی و رەخنە

من لەبەرئەوەی خاوەنی هەلۆێستی خۆم بووم و باوەڕیشم هەبووە بەوەی کردوومەو دەیکەم، زۆرجار تووشی کێشە هاتووم لەگەڵ لێپرسراواندا، چ لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلوول و چ لە سەردەمی شۆڕشی نوێدا. هەڵبەت من هیچ مەرام و بەرژەوەندییەکی خۆیی و تایبەتیم نەبووە، بەڵکو هەر بیرم لە بەرژەوەندیی میللەتەکەم کردووتەوە بێ ئەوەی لە ڕووی هیچ کەسێکدا دابمێنم، یان چاوپۆشی لە هیچ چەوتی و هەڵەیەك بکەم. زۆرجار باجی ئەم هەڵوێستانەشم داوەو گرفتم بۆ دروست بووەو بێ منەتیش بووم، چونکە ئەنجام باوەڕم بە کێشەی ڕەوای میللەتەکەم هەبووە، کە لە سەرووی هەموو کێشەیەکەوەیە.

وەك چۆن چەکم هەلگرتووەو بەربەرەکانێی دوژمنانی میللەتەکەم کردووە، هەروەها لەنێو شۆڕشیشدا ئەوەندەی بۆم کرابێ لە ڕووی هیچ کاربەدەستێکدا سلمنەکردوەتەوەو مافم پشتگوێ نەخستووە. دەسەلاتدارانی کورد، ئەگەر شتێکی ناپەسەندیان کردبێ، بە ئاگام هێناونەتەوە. بۆیە زۆرجار تووشی کێشەو ناکۆکی بووم لە هەندێ شوێندا.

من پێم باشە هەرکەسێ پۆستو دەسەڵاتی دەکەوێتە دەست، هەوڵبدا کاری باش بکاو بەرژەوەندییەکانی خەڵکی کوردستان بپارێزێ، ئەمەش سەرمایەیەکی پیرۆزە بۆ پاشەڕۆژی ئەو کەسانە.
هەڵبەت زۆربەی زۆری خەڵکی کوردستان لەم شۆڕشە خوێناوییەدا بەشدار بووە. ئێمەی کاربەدەستان زۆر شتمان رووبەڕوو دەبێتەوە لەلایەن کەس‌وکاری شەهیدانو پێشمەرگە بێدەستو بێ چاوو بێ قاچەکانەوە. ئەوانەی ناو دەبرێن بەکەم ئەندامانی شۆڕش، زۆرجار گلەیی ئەوە دەکەن وەکو پێویست لایان لێناکرێتەوەو رێزیان لێناگیرێ، ئەمەش شتێکی زۆر خراپەو زۆر لە رێزو شکۆو حورمەتی شۆڕشەکەمان کەم دەکاتەوەو ناحەزانی شۆڕشەکەمان سوودی لێوەردەگرنو کێشەو دۆزەکەمانی پێ ناشیرین دەبێ.
من پێم باشە زۆر رێز لە کەسو کاری شەهیدان بگیرێو حسابێکی تایبەتییان بۆ بکرێو بەچاوی رێزو وەفاو نازەوە تەماشا بکرێنو رێز لەو کەسانە بگیرێ، کە لەپێناو میللەتەکەیاندا دەستو چاوو قاچیان لەدەست داوەو کەم ئەندام بوون. هەروەها رێزو حورمەت بۆ ئەو پێشمەرگە دێرینانە دابنرێو یارمەتیی باشیان بۆ دابین بکرێ، چونکە ئەم ئازادییەی ئێستا لە کوردستاندا هەیە، بەری رەنجی دەیان ساڵەی شەهیدانو ئەو خەڵکانەیە، کە خۆیان لەم پێناوەدا بەخست کردووە. چەندێکیش ئێمە رێز لە خەڵکە چاکەکە بگرین، هێشتا هەرکەمەو

بەشێکە لە خەباتی ئێستامان. هەروەها هەوڵ بدەین خەڵکە چاکەکە ڕێزمان بگرن لە ڕێگەی مامەڵە چاکەکانمانەوە. ئەوان هەست بەوە بکەن ئەم ژیانە ئازادە خەباتی خەڵکە تێکۆشەرو خەباتگێڕەکەی جارانە، کە ئەمڕۆ کورد لە پەنایدا دەحەسێتەوەو نابێ هیچ کاتێکیش ئەمە لەبیر بکەین.

✍ لەدوای ڕاپەڕینەوە، زۆرکەس دەهاتنەلامو باسی ئەوەیان دەکرد، کە بۆچی ڕێگە بە هەندێ بەرپرسو فەرماندە دەدرێ هەر بیر لە خۆیانو دەوروبەرەکەیان بکەنەوەو بەرژەوەندیی گشتی فەرامۆش بکەن، بۆچی لە کەسو کاری شەهیدانو خەڵکە خەباتگێڕو ماندووەکە نەپرسنەوە، کە بە درێژاییی شۆڕشی ئەیلوولو شۆڕشی نوێ تووشی چەندین کارەساتی جۆراوجۆر بوون. زۆر کەس گلەییان لێدەکردین، کە هەق وایە ئەو شتانە لای هەڤاڵی بەڕێز (مام جەلال) باس بکرێ. بۆ نموونە، لێپرسراوی وا هەیە سێ جار زەویی وەرگرتووەو خانووشی وەرگرتووەو زەویەکانیشیان فرۆشتووە بە پارەیەکی خەیاڵی، بەلام دەیان خێزانی شەهید زەویەکی چەپەكو پەراوێزیان وەرگرتووە، کە داویانە بە ٥ تا ١٠ هەزار دینار. دەیانگوت هەق وایە ئەم شتانە باس بکرێ لای بەڕێز (مام جەلال)، چونکە خەڵکی دەزانێ، کە بەڕێزیان هیچ لایەنگیری ئەو شتانە نییە. من بۆ خۆشم زۆرجار لای بەڕێز (مام

جەلال) ئەم شتانەم باس کردووەو خۆیشم ئاگام لێ بووە زۆرجار بەڕێزی باسی ئەوەی کردوە، کە دەبێ ئێمە خزمەتکاری میللەتەکەمان بین‌و هەموو خێرو خۆشییەکمان بۆ کەس‌وکاری شەهیدان‌و خەڵکی کوردستان بوێ، بەڵام ناچاریش هەندێ شت دەسەپێنێ.

لێرەدا دەمەوێ گلەیی لە هەندێ لە نووسەران‌و رۆشنبیرانیشمان بکەم.

دەڵێم لەڕاستیدا ئێمە، سەرەڕای ئەوەی رۆشنبیرو هونەرمەندو نووسەری چاکمان هەیە، بەڵام بەداخەوە هەندێکیان لە ئاستی خستنەڕووی داکەوتی میللەتەکەمان خۆپەرست‌و بێ ویژدانن. لە ٢٠٠٢/٣/١٦، کە بۆنەو یادیساڵڕۆژی کیمیابارانی شاری هەڵەبجەی شەهید بوو، لە چەندین گۆڤارو پەرتووك‌و رۆژنامەدا، کە بە چاپیان گەیاند، زۆر بابەتیان لەسەر رۆژە نووسی، بەڵام بەداخەوە لە هیچیاندا ناوی شەهیدەکانمانی تێدا نەبوو، باسی ئەو پیاوە تێکۆشەرانەی تێدا نەبوو، لە بارەی ئەوەی، کە کێ بوون‌و کێ نەبوون. لە ساڵی (٢٠٠٢)دا، کە ئێمە حاکم بووین لە کوردستانی عیراقداو دەمانتوانی لەڕووی مێژووییەوە سەبارەت بە یادی شەهیدەکانمان شتی چاکتر بکەین‌و ئێمە دەمانتوانی هەندێ لەم باسانە بخەینە رووپەڕی رۆژنامەو گۆڤارەکانی تایبەت بە هەڵەبجەوە، بەڵام مخابن، ئەوەمان نەکرد.

هەڵبەت ئێمە، کە پێشمەرگە ووین، بە خەباتی چەکداری هیچ درێغیەکمان نەکردو داوای هیچ پاداشتێکیش ناکەین، بەڵام بۆ رای گشتیو وەکو وەفایەك بۆ شەهیدان، وا رەوایە لە کۆڕو کۆمەڵو بۆنەکاندا درێخی لە باسکردنیان نەکەنو ناویان بهێنن. رۆشنبیران پەنجەو خامەیان باشەو لە زۆر کۆڕو کۆمەڵدا بەشداریی دەکەن، وا رەوایە ئەم کارە مێژووییانە لە ئەستۆی ئەواندا بیّ. هەڵبەت ئێمە وەکو پێشمەرگە توانیمان میللەتەکەمان لە رێگەی شۆڕشی چەکداریو خەباتی سیاسییەوە بە جیهان بناسێنین. زۆر کەسمان هەیە لە هەردوو شۆڕشەکەدا بەشداریی کردووە، چ لە شۆڕشی ئەیلوولو چ لە شۆڕشی نوێی گەلەکەماندا، بەڵام زۆر بەداخەوە ناوی ئەو کەسانەمان بەجاریّ فەرامۆشکردووە، تەنانەت هیچ حسابێکیش بۆ خێزانەکانیان ناکریّو رێز لە خەباتەکەشیان ناگیریّ. بێگومان ئەمە کاریگەرییەکی سلبیی زۆری لەنێو کۆڕو کۆمەڵو خەڵکدا هەیە. من زۆر کەسم بینیوە، بە تایبەتی ئەو کەسانەی ماونو بەشدارییان لە شۆڕشی ئەیلوول، یان شورشی نوێدا کردووەو پێشمەرگە بوونو هەموو تەمەنی گەنجیی خۆیان لە پێناوی کورددا خەرج کردووە. ئەم پێشمەرگەیە بۆ کورد بەرگەی برسێتیو نەبوونیو هەزارو یەك جۆر نارەحەتیو روبەڕووبوونەوەی مەرگی گرتووە، لەگەڵ هەر پارتو لایەنێکی سیاسی

بووبێ، بەڵام هەر پێشمەرگە بووە، ئیدی بۆچی وا باس لەمیان بکرێو باس لەوی دییان نەکرێ؟ یاخود وا ناوی لێ بنرێ، ئەم پێشمەرگەی ئەیلوول بووەو نەخێر ئەویان پێشمەرگەی شۆڕشی کۆنو ئەویشیان نوێ..! لە کاتێکدا پێشمەرگەو شۆڕش کۆن بێ، یان تازە، هەردووکیان شۆڕش بوونو هەردووکیان لەپێناو کورددا بوون؟ ئەگەر لە حاڵەتێکیشدا لێپرسراوەکان بیریان لە شتێ کردبێتەوە، یان جیاوازییەکی نێوخۆییان هەبووبێ، یان دەستەگەری هەبوو بێ، ئەوا پێشمەرگە گوناهی چی بووە؟ هەق وایە پێشمەرگەکان بە یەك چاو تەماشا بکرێن، بێجگە لەو کەسانە نەبێ گێرەشێوێن بوون، یان خیانەتیان کردووە. دەڵێم، ئەم نەوەیەی ئێستا، کە خامە بەدەستنو رۆشنبیرنو خاوەن بڕوانامەن، هەق وایە گوێ لە خەڵکانیتریش بگرن، کەوا رابردوویەکی پاکیان هەیەو خاوەنی خەباتنو رۆڵیان لە شۆڕشەکەدا هەبووە، چ وەکو پێشمەرگەو کادرو چ وەکو رۆشنبیرو نووسەر. لەڕاستیدا فەرامۆشکردنی رۆڵی ئەو تێکۆشەرانە باش نییە، بەڵکو هەق وایە گوێ لە هەموو کەس راگرینو بە باشی رێزی خەڵکە تێکۆشەرەکە بگرین، چونکە ئەو خەڵکانە لە شۆڕشی ئەیلوول یا لە شۆڕشی نوێدا رۆڵیان هەبووە، هیچ رۆژێ خیانەتێکیان نەکردوە یان کاریگەرییەکی خراپیان لەسەر بزووتنەوەی کورد نەبووە. ئەوانەش،

که خیانهتیان کردووه یان کۆسپ بوون له ڕێگهی بزووتنهوهی کوردیداو بازرگانی جهنگ بوون، چییان لهگهڵدا بکرێ ههقی خۆیانه.

من لێرهدا وهك پێشمهرگهیهك گلهییم ههیه لهو کهسانهیه، که دهسهڵاتیان دهکهوێته دهست ههر بیر لهخۆیانو دهورو بهرهکهیان دهکهنهوه. ئێمه دهبێ ههمیشه به وهفا بین بهرامبهر به کهس‌وکاری شههیدو خهڵکه ماندووهکه، ههروهها خهڵکی دێهاتهکان، که ساڵانێکی دوورو درێژی خهباتمان بهههموو شێوهیهك بهشداریی ئهم شۆڕشهیان کرد. ڕۆژانه خهڵکی جۆراوجۆر دهبینم، که ناڕهزایی خۆیان دهردهبڕن بهرامبهر به ههڵس‌وکهوتی ههندێ له لێپرسراوان که داخهوه وهك پێویست ناچن به دهمیانهوهو ڕێزیان لێ ناگرن. بۆیه داواکارم لهو کهسانهی ئیش‌و کاریان پێ دهسپێردرێ ههوڵ بدهن له پێش ههموو کهس کێشهی لێقهوماوان‌و شههیدان‌و کهس‌و کاریان به شێوهیهکی گونجاو چارهسهر بکهن، چونکه کورسی‌و دهسهڵات تاسهر بۆ کهس نییه. ئهم ئازادییهی ئێستا ههیه، ئاکامی خهبات‌و تێکۆشانی شههیده قارهمانهکان‌و خهڵکه چاك‌و به ئهمهکهکهی کوردستانه، ههق وایه بهرژهوهندی تاکه کهسی بخرێته لاوهو بهرژهوهندی گشتی ببێته ئاوات‌و ئامانجی لێپرسراوان، چونکه ئهو شتانه زهقه‌و ناشاردێنهوه.

من به مافی خۆمی دهزانم ئهم قسانه بکهم، چونکه دهیان کوڕو براو باوکی خهڵك لهگهڵ مندا بوون‌و شههید کراون‌و زۆربهیان دێنه لای

من سکاڵا دەکەن، کە تا ئێستا وەکو پێویست هیچیان بۆ نەکراوە. بە پێچەوانەشەوە، جۆرە خەڵکێ هەن زیاد لە رادە کاربەدەستییان دراوەتێ‌و شایەنی ئەوەش نین. بە باشی ئەزین بێ ئەوەی ماندوو بووبن لەم شۆڕشەدا.

✍ لەراستیدا ئەو زوڵم‌و زۆرەی دوژمنان دژ بە میللەتی کورد کردوویانە. هەرجارەی بە شێوازێ بووە. یەکێ لەو شێوازانەی ئیمڕۆ دەبینین، لەژێر دروشمی بە ساختەی (موسوڵمانێتی)یەوەیە. من پێم وایە، هەر کارو کردەوەیەکی دوژمنکاری دژ بە کوردو کێشە رەواکەی بێ، بە هەر ناوێ بێ‌و لەژێر سایەو باڵێکدا بێ، سەرەتا دژ بە مرۆڤایەتییەو ئەوجا دژ بە نەتەوەی کوردە. من بڕوا ناکەم هەر زوڵمێ بە هەر ناوو دروشمێکەوە بێ، کورد قبوڵی بکا.

من بۆ ماوەیەکی زۆر لە وڵاتی (سوید)دا ژیاوم. لەوێ زۆر باسی ئەوە دەکرێ، کەوا لە هەڵەبجەدا بە کۆمەڵ خەڵك کوژراوە، ئەوان زۆر پێیان قورس‌و ناخۆشە. سویدیەکان هەر فیلمێکی هەڵەبجە لە کەناڵی تەلەفزیۆنەکەیاندا نیشان بدرێ، ئەگەر منداڵیان لە ماڵدا بێ تەماشا بکا، دەڵێن: با ئەو منداڵە نەیبینێ، چونکە کاریگەری دەبێ لەسەر عەقڵیان‌و لەسەر هەست‌و ویژدانیان. ئێمە باشترە ئیمڕۆ لە روویەکەوە سوود لەو بیرە وەربگرین، کە جارێکی‌تر رێگە نەدەین خاکی ئەم وڵاتە ببێتەوە بە گۆڕەپانی شەڕو وێرانکاری‌و تاقیگەی چەکە کۆکوژە

نەفرەتیەكان. زیاتر لە (٤٠) ساڵە خەڵكی كورد لەژێر ئەشكەنجەو ئازاردا دەناڵێنن‌و درێخیشیان لە خەبات‌و تێكۆشان نەكردووە، لەبەرامبەر دوژمنە درندەو یەك لەدوای یەكەكانیاندا وەستاونەتەوەو قوربانی سەروماڵیان لەم پێناوەدا بەخشیوە.

هەڵبەت كەو كاتە بەرهەمی خەبات‌و تێكۆشانە بە راستی دێتە بەر، كە خزمەتی خەڵكی بكاو چارەسەری كێشەكانیان بكا. بەڵام ئەگەر بە پێچەوانەوە بێ‌و هەركەسێ بیەوێ بەشی خۆی زیادبێ، ئەوا جەماوەر نارازی دەكاو زەمینە بۆ زوڵم‌و چەوساندنەوە خۆش دەبێتەوە.

ئێمە رۆژمان گەیاندووەتە ئەمڕۆو زۆر قەرزاری خەڵكی كوردستانین، بەتایبەتی شەهیدان‌و میللەتە لێقەوماوەكەی. ئەمەی ئێستا هەیە لە ئەنجامی خەباتی چەند ساڵەی ئەو خەڵكەیەو پێویستی بە پاراستنە.

پێویستە بە هەرجۆرێ چارەسەری كێشەی كوردستان دەكرێ هەوڵی بۆ بدرێ‌و چارەسەری بۆ بدۆزرێتەوە. ئەوەی زۆر زەقەو لە هەموو لاوە باسی لێوە دەكرێ، ئەوەیە، كە دەڵێن بۆچی سەركردەكانی كورد رێك ناكەون؟ بۆچی دانانیشن بە شێوەی گفتوگۆ چارەسەری ناكۆكییەكان بكەن؟ ئەمڕۆ نیشانەی شتەكان دیارەو بەزەقی دەبینرێ، كە دوژمنەكانی بزووتنەوەی كوردی خەریكی پیلان دانانن بەهەموو شێوەیەك، عیراق بەكرداری شەڕی لەگەڵدا كردووین‌و شەڕی لەگەڵدا

راگەیاندووین، بەڵام دراوسێکانمان بە دۆستایەتی‌و پلانگێڕی‌و بە شێوەی جیاجیا. ئێستایش باشترین شت بۆ ئێمە ئەوەیە چاوپۆشی لە شتە لاوەکییەکان بکەین لەپێناو بەرژەوەندیی گشتیی خەڵکی کوردستاندا تێبکۆشین.

بێگومان ئێمە حەز دەکەین هەموو کوردستان ئاوەدان بێتەوەو هەموو خێری بۆ خەڵکەکەی بێ، چونکە خەڵکی کوردستان بەگشتی زیاتر لە چل ساڵە تووشی هەزارو یەك دەردەسەری جۆراوجۆر بووە. بەڵام خەڵکی هەڵەبجە لەم دەردەسەریانەدا پرشکی گەورەی بەرکەوتووە. ئێستاش خەڵکی هەڵەبجە هەر چاوەڕێی ئاوەدانکردنەوەی شارەکەیانن، چاوەڕوانن چارەسەری ئەو خەڵکە بێ جێگەو بێ ڕێگەیە بکرێ، کە هەمووماڵەکانیان وێران کراوە.

لە رابردوودا هەر ماڵێ شەش حەوت ژووری هەبووە. ئەو خەڵکە دوکان‌و بازاڕو سەروەت‌و سامانیان هەموو رۆیشتووەو کەلاوەکانیان هەتاکو ئێستاش چاك نەکراوەتەوە. ئێستاش زیاتر لە دە هەزار ماڵی کوردی خەڵکی هەڵەبجە لە دێهاتەکانی سنووری (ئێران)دا کرێکاری‌و حەماڵی دەکەن‌و هەندێکیشیان پرسیار دەکەن. زۆربەی زۆریان لەژێر چادردا لە ئاوارەییدا دەژین، حەز دەکەن کێشەکانیان بۆ چارەسەر بێ‌و بگەڕێنەوە ولاتە خۆشەویستەکەی خۆیان هەتا لەناو کەس‌و کاریاندا بە سەربەرزی بژین.

# کۆتایی

من له پێشمهرگه سهرهتاییهکانم له شۆڕشی ئهیلوول داو ئهمهی باسم کرد بهشێکی زۆر زۆر کهمه له مێژووی ئهم شۆڕشه؛ ههڵبهت سهدان کتێب ناتوانێ به تهواوهتی لهسهر مهسهلهی کورد بنووسێ. دوژمنهکانمان به شێوهیهکی دڕندانه مامهڵهیان لهگهڵ کێشهی کورد کردووهو خهڵکیان کوشتووهو گرتووهو دێهاتیان سووتاندوهو زۆر کاری تری خراپیان کردووه، بێ ئهوهی ئهم زاڵمانه له ژنو منداڵو پیر دهست بپارێزن. بهڵام ئهوهی من دیومه لهم شۆڕشهی ئهم دواییهدا، چ له سهرکردهو چ له پێشمهرگه، له ههردوو شۆڕشهکهدا، واته شۆڕشی ئهیلوولو شۆڕشی نوێ، جێگهی شانازیی ههتاههتاییه بۆ نهتهوهی کورد.

بینیومه، که له زۆربهی زۆری شهڕگهکاندا دژ به حکومهت، ده پێشمهرگه بهریان به فهوجێ سهربازو زرێپۆشو تانكو فڕۆکه گرتووه. دوژمنان چهندین جار شکاونو چهندین جار به کۆمهڵ دیلیان لێگیراوهو فڕۆکهیان لێخراوهته خوارهوه. ئێمه ئهو چهکانهی دهستمان دهکهوت، ههر ئهو چهکانه بوون، که بهکارمان دههێنایهوه دژ به خۆیان، وهکو: (فیشهكو RBGو تهقهمهنیو BKC)، ههمووی هی خۆیان بوون. توانای داراییمان زۆر کهم بوو، ههتا جاری وا ههبوو دوو

ڕۆژ نانمان نەدەخوارد. ٣ مانگ جارێ ئەگەر گۆشتێکمان دەست بکەوتایە. وەکو هەر مرۆڤێ دەبوایە ئەوانەمان هەبووایە، بەڵام، کە نەبووە، سەبرو تەحەمولیشمان کردووەو زۆر شادمان بووین بەوەی، کە ئێمە بەرگریی لە میللەتەکەمان دەکەین‌و قوربانی دەدەین‌و چەکی شەرەفمان لەشاندایە. ئێمە بەو دڵ‌و گیانەوە دەچووینە شەڕگەکانەوە دژ بە حکومەت. ئەگەر بریندار بووینایە، شانازیمان بەو برینداربوونەوە دەکرد، تەنانەت خەڵکی وامان هەبوو زۆر حەزی دەکرد لەپێناوی کوردستاندا شەهید بێ.

هەڵبەت هەرکەس لە ئێمە بە ئەرکی سەرشانی خۆی زانیوە، گەر چووبێ بۆ شەڕو شەڕی کردبێ دژی دوژمنەکەی، شەڕی مردن‌و ژیانی کردووەو مەترسیی لەوە نەبووە شەهید بێ.

من دەیان پێشمەرگەم دیوە تانك شێلاوێتی لە ناو سەنگەرەکەیدا. هەڵبەت ئەو شەڕانەی کراوە بە بڕواو قەناعەتێکەوە کراوە، داینەمۆی سەرەکیی جوڵان‌و بەرگرییمان‌و ڕۆحی کوردایەتی‌و نیشتمانپەروەری بووە.

مەبەستم لەو بەسەرهاتانەی گێڕامنەوە لەم بیرەوەرییەم هەر بۆ ئەوەبوو میللەتەکەمان بزانێ ئەم شۆڕشە چۆن کراوەو ئێمە چۆن توانیومانە لە بەشێکی بچووکی کوردستاندا سەرکەوتن بەدی بهێنین‌و چەندجارێکیش چۆك بە حکومەتی (عیراق)دا بدەین‌و ناچاری بکەین

وتوویژمان لەگەڵدا بکا. ئەگەر چی ئەو وتوویژانەش بۆ بەرژەوەندیی تایبەتی خۆی بووەو بۆ پشوودان بووە بۆی، بەڵام لەو دەرفەتەشدا ئێمەش سوودمان لێوەرگرتووە بۆ پشوودان‌و دووبارە رێکخستنەوەی پێشمەرگەکانمان. هیوادارم هەموو خەڵکەکە دوای ئێمە سوود لەمە وەربگرن‌و رێز بۆ ئەو کەسانە دابنێن کەوا بەشدارییان لەم شۆڕشەدا کردووەو شەهید بوون‌و بریندار‌بوون‌و هەموو تەمەنی لاوی خۆیان بۆ رزگاریی کوردو کوردستان خەرج کردوەو لە هەموو خێرو خۆشییەك بێبەش بوون. ئەم کارەی ئەو خۆبەختکەرانە خۆی لەخۆیدا شتێکی زۆر گەورەیەو بە هیچ پارەو سامانێ ناتوانرێ پاداشت بدرێتەوە، جگە لەوە نەبێ کەوا وەکو ناسنامەیەك بۆ خێزانەکەیان لە پاشەڕۆژدا نەوەکانیان شانازیی پێوە بکەن، کە باوك‌و برایان پێشمەرگە بووەو شەهید بووە، یان رۆڵەکانیان کادری شۆڕش بوون، یان باوك‌و براو کوڕیان لەپێناوی حورمەت‌و سەربەرزی‌و سەرکەوتنی میللەتەکەیاندا بەخشیوە.

هەڵبەت تا ئێستا بەهۆی شەهامەت‌و لەخۆبوردن‌و ئازایەتیی شەهیدە سەربەرزەکان‌و خەڵکە چاکەکە، توانیومانە رۆژ بگەیەنینە ئەمڕۆ، کە ئێمە ئێستا خاوەنی پەرلەمان‌و حکومەت‌و هەوڵی چەسپاندنی فیدراڵیەت دەدەین. وا پتر لە ١١ ساڵە ئێمە ئازادین‌و خۆمان حوکمی خۆمان دەکەین‌و وڵاتانی دنیاش ئاگایان لێیە، کە بەو توانا کەمەوەو

ئەو وڵاتە وێرانەوە توانیومانە تا رادەیەك خزمەتی میللەتەکەمان بکەین‌و ئاوەدانی بکەینەوە. هەرچەندە کەم‌و کورپیشمان هەبووە، بەڵام کارە چاکەکانمان زۆر زیاترن لەوە. هیوادارم‌و داواکارم لە هەموو کاربەدەستانی حکومەتی کوردی، چ ئیمڕۆ بێ‌و چ سبەینێ بێ، هەمیشە بە چاوی رێزەوە تەماشای کەس‌و کاری پێشمەرگەو شەهیدان‌و هەموو خەڵکی بە ئەمەکی کوردستان بکەن، چونکە وەکو باسم کرد خەڵکە چاکەکە مافیان زۆرە بەسەرمانەوە، ئەوانەی کوڕو برایان کوژراوە، دەبێ رێزی تایبەتیان بۆ دابنین‌و نابێ ئەوەمان لەبیر بچێ، کە وەختی خۆی ئێمە دروشمێکمان وتووە: (کوردستان یان نەمان).

هەڵبەت ئەوەی ئیمڕۆ هەیە، بەرهەمی تێکۆشان‌و وەفاداریی ئەوانەیە، کە شەهید بوون‌و لە پێناوی ئیمڕۆی ئێمەدا گیانی پیرۆزی خۆیان لەدەست دا، یاخود هینی ئەوانەیە، کە خاوەنی شەهیدن‌و یاخود کەم ئەندامن، هەمووشیان لەپێناوی بەرژەوەندیی خەڵکی کوردستان خزمەتیان کردووە بێ ئەوەی بیر لە بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بکەنەوە وە هەموو ئاوات‌و ئامانجیان ئەوە بووە داگیرکەران ووڵاتمان بەجێ بهێڵن‌و کورد خۆی حوکمی خۆی بکا.

ئەوەی راستی بێ، جێی داخە، ئەمڕۆ خەڵکانێ هەن رێز لەم ئەزموونی ئازادییە ناگرن، دیارە نافامن ئەم شۆڕشەمان چۆن دەستی پێکردو چۆن دروست بوو، چەند قوربانیی لە پێناودا دراوە. ئەو جۆرە

خەڵکانە بیر لەوە ناکەنەوە ئەم کەش‌و بارودۆخەی ئێستا چۆن هاتە کایەوە. ئەوەی ئیمڕۆ دەیبینین جۆرە کەشێکە بێ ڕژێمی سەددام‌و بەعسی دیکتاتۆرەو جۆرە ئاسایش‌و ئارامییەك لە وڵاتەکەمادنا بەرقەرار بووە. میللەتەکە لە ئاشتی‌و تەبایی‌و یەکبووندان، بەڵکو هەموو خەڵکەکە بە دڵسۆزیەوە گوێبیستی فرمانەکانی رابەرانی شۆڕش‌و حکومەتە کوردییەکەن، بە دڵسۆزیەوە دەڕوانە بارودۆخەکەو هەر یەکە خۆی بە بەرپرسیاری مێژوو دەزانێ بۆ دەستنیشانکردنی کەموکوڕییەکان‌و گەیاندنیان بە شوێنی خۆی بۆ چارەسەرکردنی. دەبینین لە سایەی ئەم ئازادییەی لە هەرێمدایە شەوانە تا کاتژمێری (٢و٣)ی شەو خەڵك بە ئازادی لەدەرەوەیە، لەسەر شەقامەکانەو لەهەموو شەقام‌و شوێنەگشتییەکاندا ئاهەنگ‌و هەڵپەڕکێ دەگێڕن، خەڵکی دەچنە دەرەوەی شار بۆ گەشت‌و گوزارو لەهیچ شتێ ناترسن. دیاردەی چەك‌و چەکداری نابینرێ، جگە لە هێزی پۆلیس‌و ئاسایشی نێوخۆ نەبێ، ئەویش بۆ پاراستنی ئەمن‌و ئاسایشە.

سوپاس بۆ یەزدان کە شەڕو ناکۆکیی نێوخۆیی نەماوە[٧]، ئێستا گۆڕانکارییەکی زۆر لە کوردستانی ئازاددا هەیە، بەڵام دەبێ ئاگامان

---

[١] لەپاش سەردانەکەی هەڤاڵ مام جەلال بۆ هاوینە هەواری سەری ڕەش- سەلاحەدین‌و لە ٢٠٠٢/٩/٨ و لەگەڵ بەڕێز مەسعود بەرزانیدا کۆبۆوە. لە کۆبوونەوەیەکدا، کە هەردوو مەکتەبی سیاسی (ی.ن.ك)و (پ. د. ك) گەیشتنە ڕێکەوتنێکی باش بۆ ئاشتی سەرانسەری

لەوەش بێ، کە دوژمنەکانمان هێشتا نەخەوتوون و هەر بەو بیرەوەن کاری تیرۆریستی و تێکدەرانە لەنێو شارەکاندا بکەن. هەرچەندە بەوریایی و تەبایی میللەتەکەمان ئەم رووداوانە زۆر کەم بوونەتەوە، بەڵام ئێمەی کورد، دەبێ ئەو راستییەش فەرامۆش نەکەین، کە دوژمنانمان بە هەموو توانایەکیانەوە دەیانەوێ ئەم ئەزموونە دیموکراتییە لە کوردستاندا لەباربەرن. دەیانەوێ شەڕی نێوخۆمان بۆ زیندوو بکەنەوە. رۆژانە بیر لەوە دەکەنەوە چ نەخشەو پلانێ بۆ داگیرکردنی کوردستان دابنێن. بەڵام ئێمە، گەر بمانەوێ، بە ئیرادەی میللەتەکەمان هەموو هەوڵە شەڕانگێزیەکانی ئەوان پووچەڵ دەکەینەوە، ئەمیش بە پشت بەستن بە خەڵکە چاکەکەوەو لە سەروی هەموویشیانەوە حکومەتی هەرێمی کوردستان، کە زۆر بە ئاگایە لە هەموو هەڵسوکەوتێکی دوژمن و بە وریاییەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکا.

ئەم شۆڕشە زۆر خەڵکی تێکۆشەری تیادا شەهید بووەو زۆر خەڵکی چاکیش بە ئاواتەوە سەری ناوەتەوەو زۆریش کەوتووە لەسەر

---

کوردستان بە رێککەوتننامەی واشنتۆنی ساڵی ١٩٩٨. بۆیە، لە رۆژی ٢٠٠٢/١٠/٤ بۆ یەکەمجار دوای شەش ساڵ دابڕان و لە بینایەی پەرلەمانی کوردستان لە هەولێر بە ئامادەبوونی هەردوو سەرکردەو میواندراری خاتوو میتران ئەندامانی پەرلەمانی کوردستان کۆبوونەوە لە رۆژی ٢٠٠٢/١٠/٨ بۆ جارێکیتر لە بینایەی سلێمانی پاڵاسدا کۆبوونەوەو چەند بڕیارێکیاندا.

میلله‌ته‌که‌مان. له راستیدا ئه‌وه‌ی به‌رامبه‌ر به خه‌ڵکی کوردستان له زوڵم‌و تاوانکاری کراوه، له هه‌موو دنیادا ده‌نگی داوه‌ته‌وه‌و بۆته جێگه‌ی سه‌رسوورمانی هه‌موو لایه‌ك، هه‌تا ئه‌و راده‌یه‌ی گه‌یشتۆته ئه‌نفال‌و به‌کارهێنانی چه‌کی کیمیاویی.

له‌م وڵاته‌دا داروبه‌ردی کوردستان سووتێنراوه‌و زیاتر له (٤٠٠٠) دێ وێرانکراوه، ساڵێك‌و دوان‌و سیان‌و پێنج نه‌بووه، له ساڵی ١٩٦١ه‌وه تاکو راپه‌ڕین، ئه‌مه هه‌ر به‌رده‌وام بووه، به‌ڵام هه‌ر سوپاس بۆ خوا رۆژمان گه‌یاندووه‌ته ئه‌مڕۆ، که ئه‌وه (١١) ساڵ پتره، خۆمان حوکمی وڵاته‌که‌ی خۆمان ده‌که‌ین‌و ده‌ست به‌کارین. ئێستا هه‌قه ساڵ به ساڵ‌و مانگ به مانگ هه‌وڵ بده‌ین شتی کاری زیاتر بۆ میلله‌ته‌که‌مان بکه‌ین‌و زیاتر خزمه‌تی بکه‌ین‌و زیاتر به‌ده‌م ئه‌و خێزانانه‌وه بڕۆین، که له پێناوی ئه‌م شۆڕشه‌دا رۆڵه‌یان شه‌هیدکراوه یان ماندوو بوون. ئێمه له راستیدا، ئه‌گه‌ر میلله‌ته‌که‌مان دژایه‌تی بکردینایه، شۆڕشمان پێ نه‌ده‌کرا. له خه‌باتی چه‌ند ساڵه‌ماندا هه‌موو ئه‌رکێکمان له‌سه‌ر ئه‌وان بووه، په‌ناو پشتیوانمان ته‌نها میلله‌ته‌که‌مان‌و شاخه به‌رزه‌کانی کوردستان بووه، حکومه‌تی عیراق خاوه‌نی ده‌سه‌ڵات‌و توانا بووه‌و هه‌موو جۆره چه‌کێکی له دژمان به‌کارهێناوه. حکومه‌ته یه‌ك له‌دوای یه‌که‌کانی عیراق، هه‌ر له (عبدالکریم قاسم)ه‌وه تا ده‌گاته سه‌رده‌می (سه‌دام) هه‌موویان دوژمن‌و نه‌یاری شۆڕشی کورد بوون. هه‌ڵبه‌ت که‌سیان وه‌کو (سه‌دام) تاوانبارو

زاڵم‌و دیکتاتۆر نەبوون، کەسیان وەکو (سەدام) بیریان لە نەمانی کوردستان نەکردۆتەوە. ئەم زۆردارە هەزارویەك جۆر پلانی جۆراوجۆری بۆ ئێمە دارشتووە، هەر لە چۆڵکردنی دێهاتەکان‌و دروستکردنی کۆمەڵگە زۆرەملێکان‌و لەنێوبردنی خەڵکی کوردستان‌و دروستکردنی (ئەنجومەنی کارتۆنی یاسادانان‌و جێبەجێکردن) بە ناوی کوردەوە. ئێمە ئەگەر کەسوکاری شەهیدان‌و خێزانی شەهیدان فەرامۆش بکەین، مانای وایە رابردووی خۆمانمان فەرامۆش کردووە، ئەوانەی کە شەهیدکراون، ئەوانەی کەوا بەدرێژاییی ئەم شۆڕشە تووشی هەزارویەك نارەحەتیی جۆراوجۆر بوون بۆ کورد. ئەی نابێ کەسوکارەکانیان بزانن پاداشتی ئەم خۆشەویستانەیان چییەو چییان کردووە؟ جا بۆیە چەند جارێ باسم کردووەو باسیشی دەکەمەوە، ئەم شۆڕشەی ئێمە شۆڕشێکی خوێناویی بووەو هەروا بە سانایی نەماندەتوانی ئەم دەستکەوتانە بەدی بهێنین. ئەم ئازادییەی ئێستا هەیەو بۆتە مایەی خێروخۆشی بۆ زۆربەی خەڵکی کوردستان هەمووی ئەنجامی قوربانی‌و خوێنی شەهیدانە، شەهیدان ئەم رۆژەیان بۆ ئێمە هێناوەتە دی، شەهیدان قەڵاو پەناو پشتیوانی خەڵکی کوردستان بوون‌و هەموو ژیان‌و خۆشیی خۆیان‌و ماڵ‌و منداڵیان بەخشیوە بە میللەتەکەیان‌و لەم پێناوەدا، وازیان لەماڵ‌و منداڵ‌و خۆشەویستەکانیان هێناوە. لێرەدا هەقە وایە ئەو راستییەش بڵێین کە میللەتەکەیشمان

میللەتێکی زۆر چاك بووە، لەکاتێکدا کە نەدارا بووەو هیچ بەروبوومێك‌و سامانێکی وای نەبووە بۆخۆی، لە هەمان کاتیشدا ئەرکێکی زۆر گەورەیان لەسەرشان بووە، جاری وا هەبووە لە رۆژێکدا دووجار پێشمەرگە چۆتە گوندەکانیان، ئەگەر ١٠ ماڵ بووبن یان زیاتر یان کەمتر، پێشمەرگە نانی تێدا خواردووەو حەساوەتەوە، پێشمەرگەش رازی‌و بێ گلەیی بووە، ئەگەر (نان‌و دۆو ترخێنە یان دۆینە، یان نانی وشك) یان هەر خواردنێکی‌تر بووایە، ئەوا خواردوویەتی. لەوانەیە هەندێ لەو پێشمەرگانە لە ماڵی خۆیدا ئەو شتانەی نەخواردبێ، بەڵام لەو کاتەدا بەوە رازی بوو. رازی بووە بەنان‌و چاو ماست. لە راستیدا ئێمەی پێشمەرگە جاری واش هەبووە لە گوندەکاندا دابەش دەبووینەتە سەر ماڵێ، کە نەداربووە، تەنانەت نەیبووە نان‌و ماستمان بداتێ، چونکە ئەمە رۆژو دوو رۆژو ساڵ‌و دووساڵ نەبوو، بەڵکو بەدرێژاییی ئەم شۆڕشە ئەرکمان هەر لەسەر شانی ئەو خەڵکە بووە. هەندێ جاریش دەچووینە ماڵێکەوە ئیزنیان داوین، گوتوویانە "بەخوا هیچمان نییە." بەڵام ئێمە هەر قبوڵمان بووە، هەرپێمان خۆش بووە. هەر چەند زۆر لە پێشمەرگە لە ماڵی خۆیدا لە شار ژیانێکی باش‌و خۆشگوزەرانی هەبوو، بەڵام کە لە شاخ بووە، تەنها رازی بووە بەوەی بکەتایەتە ماڵێ روویەکی خۆش‌و نان‌و چایەکی بدەنێ‌و بڕوا، بێگومان خەڵکەکەش زۆرماندوو بووبوو بەدەستمانەوە. ئەگەر بەیانی بووایە

یان نیوەشەو، دەچووینە ماڵەکانیان. سەرمامان بووبێ یان باران باریبێ‌و تەڕبووبین، یان بێتاقەت بووبین، لەخەومان هەڵساندوون‌و ئەوەی هەبووایە لە خواردن پێیان دەداین‌و زۆر خۆشحاڵ دەبووین‌و دەڕۆیشتین. بەڵام سەرەڕای هەموو کەم‌و کورپییەك‌و رەوشی ناتەواوو نالەباری ژیانی هەندێ لەو دێهاتانە، کەچی ئەوان هەر درێخییان نەکردووە، جاری وا هەبووە لە ناوەختدا، ئێمە (٣٠) پێشمەرگە یا (٤٠) پێشمەرگە روومان کردۆتە دێیەکی شەش حەوت ماڵی، منداڵەکانیان لەبەر هەیوانە گەورەکاندا کۆدەکردەوەو ژوورەکانیان بۆ چۆڵ دەکردین‌و زۆپایان بۆ دادەخستین‌و چایان بۆ لێدەناین‌و خزمەتی کوردانەیان دەکردین.

ئیمڕۆ ناو بەناو باسی ئەوە دەکرێ، کە هەر جارەو (٥٠٠ تا٢٠٠٠ ) خانوو لە شارە گەورەکاندا دروست دەکرێ. هەڵبەتە ئەمە جێی دڵخۆشی هەمووولایەکمانە. ئێمە دڵخۆشین بەوەی رۆژانە لە هەموو شوێنەکانی کوردستان، بە سەدان خانوو دروستبکرێ. بەڵام لە هەمان کاتیشدا هەق وایە بیرێکیش لە خەڵکی هەڵەبجە بکرێتەوە لەبارەی دابینکردنی جێگاو رێگایەك بۆ خێزانەکانیان، کە تائێستا لە شوێن کەلاوە رووخاوەکانی خۆیاندا ژیان بەسەر دەبەن. پێویستە ئەوەش بڵێین، بێجگە لە خەڵکی هەڵەبجە، خەڵکی کوردستان بە گشتی کارەساتی زۆریان بەهۆی شۆڕشەوە بەسەر هاتووە، وەکو: ئەنفال‌و

بەکۆمەڵ کوشتنی گەنجو پیر لەنێوماڵو منداڵی خۆیانداو سەدان هەزار زیندانیو کەم ئەندامی بێدەستو بێ قاچو بێ چاو. هیوادارم هەوڵ بدرێ، لە لایەن کارگەر دەرفەتێ رەخسا، بە چاوێکی نیشتمانپەروەرانە تەماشای هەموو لایەکیان بکرێو لا لە هەمووان بکرێتەوە.

هەڵبەت ئێستا لەبەر باری سیاسیو ئەقلیمی، یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان هەموو شتێکی پێناکرێ. بەڵام هەوڵ بدرێ لەگەڵ لایەنەکانیتردا بیرێ لە هەڵەبجە بکرێتەوە. چونکە ئەم شارە لە هەموو سەردەمەکاندا شوێنی سەدان پیاوی نووسەرو شاعیرو مەڵبەندی تێکۆشەرانو نیشتمانپەروەران بووە.

لە ئێستاو لە رابوردووشدا دوژمنەکانمان بە چەندین جۆر هەوڵیانداوە بۆ تێکدانی ئەم ئەزموونەی ئێستا لە کوردستاندا هەیە. ئەم تەباییو ئاشتیو برایەتییە، کە هەیە. هەر جارەو جۆرە گروپێ دروست دەبنو هەر جارەو بە چەشنێ ئاژاوە دەنێنەوە. بۆ نموونە وەك گروپە سەلەفیەکەی بە ناوی (جند الاسلام)و (انصار الاسلام)، کە لە هەڵەبجەو ناوچەکانی دەوروبەری بەتایبەتی کەوتنە گیانی خەڵکە هەژارەکە، کە چەندین ساڵە وڵاتەکەیان وێران بووەو بەتەمای ئەوەن ئاوەدانی بکەنەوەو باخەکانیان سەرلەنوێ بژێننەوە، هەروەها بتوانن بژێویی خۆیانو ماڵو منداڵیان پەیدا بکەن. ئەو کۆمەڵە گێرەشێوێنانە

سەر لەو خەڵکە تێکدەدەنو زوڵمیان لێدەکەن بە ناوی ئیسلامەوە. نازانم لە چ یاسایەکی دونیاو ئیسلامدا باسی ئەوە دەکرێ دەبێ مرۆڤ بەزۆر ئیسلام بکرێ بەو جۆرەی ئەو سەلەفییانە دەیانەوێ، یاخود یاسای ئەفغانستانو تاڵیبان بهێننو لە کوردستانو بەتایبەت لە ناوچەی هەڵەبجەو شارەزوور هەوراماندا جێبەجێی بکەن. بەراستی خەڵکەکە وای لێهاتووە بڕوای بە ئایین نەمێنێ. ئەگەر وا بێ، ئەوانە دژایەتیی ئایین دەکەن. بێگومان ئەمانە دراوسێکانمان یارمەتییان دەدەن، بەڵام ئەوانە با بزانن کەوا کێشەی کورد کێشەی میللەتێکە بە هیچ لایەك لەنێو ناچێ، چونکە ئەمە کێشەی میللەتێکی هۆشیارو خاوەنی مێژوییەکی دێرینە، دوژمنەکانمان خەیاڵیان خاوەو ئێستا بێ، یان ئایندە، هەر دەبێ کورد بە مافی ڕەوای خۆی بگا.

گوایە ئەمانە بەرنامەیەکیان پێیەو لە (ئەفغانستان)ەوە هاتوون بۆ ناوچەی تەوێڵەو بیارەو دەیانەوێ هەڵەبجە داگیربکەن، ڕۆژانە خەریکی دانانی مینو تەقاندنەوە بوون. ئەوانە پەیڕەوو پرۆگرامیان ئەبوو، کە ژن نابێ هیچ کوێی بەدەرەوە بێو دەبێ تەنانەت لەکاتی ئیشوکاریشدا عەبایان بەسەرەوە بێ. نابێ مزگەوتو تەکیەو خانەقاو مەکتەب هەبێو نابێ رادیۆو تەلەفزیۆن هەبێ، نابێ وێنەی مردوو هەڵبواسرێ. ئەمانە گروپێکی تازەن دروستکراونو هەموو بەدبەختیو ماڵ وێرانییەکیش بەوانەوە رووی کردە خەڵکی هەڵەبجە. ئەم گروپە

رۆژانه تۆپ بارانی دهوروبهری ههڵهبجهیان دهکرد، که بووه هۆی کوشتنی چهندین هاوولاتیو سووتاندنی خهڵهو خهرمانو رهزو باخو بهروبوومیان. ههروهها به خهڵکی دهوروبهرو دێهاتهکانی (تاوێره)و (هاوار)و (زهردههاڵ)و (دهرگا شێخان)یان رادهگهیاند، که دهبێ گوندهکانیان چۆڵ بکهن. پاشان له دهوروبهری گوندهکانیان لوغمیان دادهناو چهندین جوتیاری بێ تاوانی پێوه بوو بۆ ئهوهی هیچ کهسێ نهتوانێ هاتووچۆ بکا بۆ ناو رهزو باخهکانیان. بهمهش ئهم دوو سێ ساڵهی رابردوو زهرهرو زیانێکی مادیی زۆر له خهڵکی ههژارنشینی ئهو ناوچانه کهوت. جگه لهوه ئهو گرپه دهستیان کرد به رووخاندنی مهرقهدی (شێخانی تهریقهتی نهقشبهندی)و بردنی روفاته پیرۆزهکانیان بۆ شوێنێکی نادیار. ههروهها تهعهدایان له (کاکهییهکان)ی گوندی (هاوار) کردو رۆژانه TNT له شاره شارۆچکهکانی کوردستاندا دهتهقاندهوه.

ههڵهبجه چهندین پیاوی موسڵمانو دینداری تیادا بووه. ئهو پیاوانه چهندین مزگهوتو خانهقاو حوجرهیان ههبووه.

ئهم پیاوانه یارمهتییان له کهس قبوڵ نهکردووه. جگه له زهکات نهبێ ههتا مووچهی حکومهتیشیان قبوڵ نهکردووهو پارهی هیچ لایهنێکیان وهرنهگرتووه. بێگومان ئهوانه پیاوی ناوداری ناوچهی ههڵهبجه بوونو

هەڵەبجە لە ساڵکانی پەنجادا نەك هەرجێگەی ئایین بووە، بەڵکو جێگەی هەموو کەسێکیش بووە. هەر کەسەو بە بیرو بۆچوونی خۆی. هەر کەسێ جگە لە شتی ناشەرعی، هەرچییەکی کردبێ لەو شارەدا کەس رێگری نەبووە، موسڵمانانیش هەبوونو نوێژو رۆژویان گرتووەو خێرو خێراتیشیان کردووەو بە پیر هەموو کێشەکانی خەڵکی لێقەوماوەوە چوون. بەڵام ئەمەی ئێستا بەڵایەکی گەورەیە، رووی کردۆتە شاری هەڵەبجە. باشە خەڵکی هەڵەبجە گوناهمان چییە؟ دراوسێکانمان بەحساب موسڵمانن‌و باسی ئایینداری خۆیان دەکەن. باشە بۆچی وا هەڵسوکەوتمان لەگەڵدا دەکەن؟ بۆچی رێ دەدەن بەو پیاوخراپانە سەدان هەزار کیلۆمەتر رێگە ببڕن بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیان‌و بۆ پارە پەیداکردن بەناوی ئاینەوە دێن بەچەك‌و بەزۆر ئەوشتانە فەرز دەکەن بەسەر خەڵکەکەداو رێزو حورمەت بۆ ئاین ناهێڵن؟ بێگومان ئەمە دەستی وڵاتانی دراوسێی تێدایە، لەکاتێکدا ئێمە خراپەمان لەگەڵ ئەواندا نەکردووە، ئێمە میللەتێکی چل ملیۆن کوردی بەشکراوین بەسەر چەند دەوڵەتێکداو چەندان ساڵە دەمان چەوسێننەوەو زوڵممان لێدەکەن. ئایا قورئان باسی کردووە، کە ئەم میللەتە گوناهبارن‌و دەبێ سزا بدرێن بەم شێوەیە؟ لە راستیدا نە خوا رازییەو نە هیچ مرۆڤێکی بە ویژدان سەبارەت بەوەی بەرامبەر بە خەڵکی هەڵەبجە دەکرێ. ئەوە نیو سەدەیە ئەم شارە بە درێژایی

هەمووشەڕەكانو لە ساڵی ١٩٦١وە هەتاكو ئەمڕۆ بە چەكی جۆراجۆرو بە فڕۆكەو بە ناپاڵم لێ یان دراوە، ماڵیان سووتێنراوە.

ساڵی ١٩٨٧ زیاتر لە (٥٠٠) ماڵیان لەكانی عاشقان رووخان بەسەر خەڵكەكەداو دەیەها كەسیان كوشتو ئەوانەش، كە بە بریندار بردبوونیان بۆ نەخۆشخانە بۆ چارەسەر، (ئەمنو ئیستخبارات) بەناوی چارەسەركردنەوەو بردیانن بە زیندوویێتی كردیانن بەژێر خۆڵەوە لەولای (حەوزی بەلۆعەكەوە) لەڕێی باموك. لەكاتی رووداوەكەشدا خەڵكانێكی زۆر بە پێی پەتیو بە رووتیو قوتی لە ترسی رژێم رایانكرد بەرەو سنووری ئێرانو هەموو شتێكیان لە سەروەتو سامان بەدوای خۆیانەوە بەجێهێشت. تەنانەت لە بێشكەدا منالیان لێبەجێمابوو. لەو كەسانەی زیندە بەچاڵ كران: عوسمانی عەلی حاجی ساڵح خۆیو برازاكەی، عوسمان سەیید عەلی بە خۆیو ماڵو مندالیەوە، باقی حەسەنو عنایات حمە ئەمین بە خۆیو خێزانەوەو چەند خێزانێكیتر.

ئەگەر بە درێژایی ئەو شۆڕشەش شەڕ وەستابێ لە شوێنەكانیتری كوردستاندا بۆ چەند مانگێ، ئەوا لە هەڵەبجەدا شەڕ هەر بەردەوام بووەو خەڵك كوژراوەو ماڵیان وێران كراوە. بەڕاستی هەر لە توانای خەڵكی هەڵەبجەدایە ئەو ئارامگریە. بێگومان شت زۆرە لەسەر هەڵەبجەو خەڵكەكەی باس بكرێ، نەك من وەك خەڵكێكی ئەو شارە،

بەڵکو ئەوەی ویژدانی هەبێو ئەوەی لە هەڵەبجەدا ژیابێ دەزانێ هەڵەبجە چی بووە لە رابردوووداو ئێستادا چی بەسەر هاتووە. ئێستاش خەڵکی هەڵەبجە هەر چاوەڕێی ئەوە دەکەن، کە لایەکیان لێبکرێتەوەو چارەسەری کێشەکانیان بۆ بکرێ. هەتا گۆڕە بەکۆمەڵەکانی هەڵەبجەش شوێنی وای هەیە دووسەد جەنازەی تێدایەو پەرژینێکی وەکو پێویست بۆ دروست نەکراوە. بێگومان ئەوانەی، کە ناوی خۆیان ناوە موسڵمان، دەبێ زیاتر لە خەڵکانیتر بەتەنگ ئەو شتانەوەبن بۆئەوەی خەڵكو ئاژەڵ بەسەر گۆڕەکاندا هاتووچۆ نەکەنو لەقەدرو حورمەتی ئەو شەهیدانە کەم نەکرێتەوە.

لە ساڵی ١٩٨٨، بە کیمیاویی زیاتر لە (٢٠٠) کەسی وەکو خاڵۆزاو پورزاو ئامۆزاو خوشکەزاو کەسوکاری نزیکمان شەهیدبوون. بەڵام بە داخەوە ناتوانم لەم بیرەوەریەمدا ناوو مێژووی ژیانی هەموو ئەوانە بنووسمەوە، چەنکە وەکو پێویست ناتوانم ناووناونیشانی رۆژەکان بڵێمو بەڵگەنام نەماون، چونکە من پێشمەرگە بوومو هەردوو مانگو سێمانگ لە شوێنێ بووم لە (خانەقینو سەرتەکی بەمۆو زمناکۆو باڵامبۆو هەورامانو هەڵەبجەو شارەزوورو پێنجوینو چوارتاو ماوەت)و هەتاکو دەگاتە ناوچەی (بادینان). هەروەها لە بەشێکی ئێرانو (کونەمشکە)و (ئەڵوەتان)یشدا بەشداریم لە شەڕی هاوبەشی برادەرانی دیموکراتی ئێران، لەگەڵ بەڕێز (مام جەلال)دا کردووە.

هەڵبەت ئەوەی من کردوومە بۆ رزگاریی کورد بۆ رێزو حورمەتی کورد هیچی بەفیڕۆ نەچووەو بە دڵخۆشییەوە جێی خۆی گرتووە. ئەو شوێنانەش خەباتم تێدا کردبێ. هەموو خەڵکەکە دەزانن، رەنگە زۆربەی زۆریشیان ئێستا لە ژیاندا مابن.

# کتێبو بڵاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری کە لە ساڵی ٢٠٠٤ دا چاپو هاوکاری کردوون

| ژ | ناوی کتێب | نووسەر / وەرگێر | جۆری کتێب | جۆری چاپکردن |
|---|---|---|---|---|
| ٢١٩ | گەشتی کوردستان | گەلاوێژ | رۆمان | چاپکردن |
| ٢٢٠ | ژیلەمۆی گەرمیان | شێخ سەعید شاکەلی | بیرەوەری | چاپکردن |
| ٢٢١ | باڵندەکانی بەرباران | نەجات نوری – ئاکۆ کەریم | چیرۆك | چاپکردن |
| ٢٢١ | رەشەبای ژەهرو ئەنفال / بەشی دووەم | عەبدوڵا کەریم موحمود | رامیاری | چاپکردن |
| ٢٢٢ | پیری کێوان | مەولود ئیبراهیم حەسەن | چیرۆك | چاپکردن |
| ٢٢٣ | داقوق فی التاریخ | محەمەد جەمیل رۆژبەیانی | مێژوویی رامیاری | چاپکردن |
| ٢٢٤ | چریە چریی ئەودیو ئازادییەکانی ژن | جەبار سابیر | کۆمەڵێ ووتار | چاپکردن |
| ٢٢٥ | دیاری کوردستان | ئا/ ئەحمەد باوەر | رۆنامەگەری | چاپکردن |
| ٢٢٦ | کیف الحقت کوردستان الجنوبیة بالدولة العراقیة ؟ | خالید دلێر | مێژووی – رامیاری | چاپکردن |
| ٢٢٧ | مهابادو کورتە مێژوویەك | عومەر باڵەکی | مێژووی | چاپکردن |
| ٢٢٨ | ناسیونالیزمو ناسیونالیمی کوردی | جەعفەر عەلی | رامیاری | هاوکاری |
| ٢٢٩ | شەپۆلێکی گەورە لە گوندێکی بچوکدا | پێشرەو ئەحمەد | رەخنە | چاپکردن |
| ٢٣٠ | بیبلۆگرافیای چاپوبڵاوکردنەوە | ئەکرەم محەمەد | بیبلۆگرافیا | چاپکردن |
| ٢٣١ | ناتوانن پەیڤەکانم زیندانی بکەن | فەهمی قەرەداغی | بابەتی رۆژنامەوانی | چاپکردن |
| ٢٣٣ | لە شنرویێوە بۆ.. | حەمەی فەرەج | بیرەورەی | چاپکردن |
| ٢٣٤ | گۆڤاری تێکست/٢ | وەزارەتی رۆشنبیری | گۆڤار | چاپکردن |
| ٢٣٥ | بەسەرهاتی نیدی | مژدە محەمەد | منداڵان | چاپکردن |
| ٢٣٦ | ئاواز گەلی کوردی | دڵشاد سەعید | مۆسیقا | چاپکردن |
| ٢٣٧ | رۆشنبیریمان | فوئاد تاهیر | رۆشنبیری | چاپکردن |
| ٢٣٨ | خەونی سەربەخۆیی .. | عەتا قەرەداغی | رامیاری | چاپکردن |
| ٢٣٩ | کۆمەڵگەی داخراو | ئاسۆ جەبار | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٢٤٠ | کرکوك الجریحة | ئەحمەد رەشید بیبانی | رامیاری | چاپکردن |
| ٢٤١ | فەرهەنگ [illegible] | کامەران [illegible] | فەرهەنگ | چاپکردن |

| ٢٤٢ | حیكایەتەكانی ئەنفال | تەها سلێمان | هۆنراوە | چاپكردن |
|---|---|---|---|---|
| ٢٤٣ | رۆڵی گۆڤاری گەلاوێژ.. | محەمەد دلێر | رۆژنامەگەری | چاپكردن |
| ٢٤٤ | دەستەوارەیێ نان بۆ مێژوو | كەمال رەئووف محەمەد | لێكۆڵینەوە | چاپكردن |
| ٢٤٥ | میحرابی سێشەممە رۆمانسییەكان | دانا عەسكەر | هۆنراوە | چاپكردن |
| ٢٤٦ | بزووتنەوەی شعوبیەت | سەلام عەبدولكەریم | رامیاری | چاپكردن |
| ٢٤٧ | مامۆستا عەزیز ژیانێكی پاكو شەهیدی دەستێكی ناپاك | ئا/ محەمەد عەبدولكەریم | بیرەوەری | چاپكردن |
| ٢٤٨ | حزب الديمقراطي الكردستاني حركة قومية الكردية | د. شێركۆ عبدالله | رامیاری | چاپكردن |
| ٢٤٩ | جەمال تاهیر قارەمانی شۆڕشو زیندان | ئا/ محەمەد سۆڵەیی | بیرەوەری | چاپكردن |
| ٢٥٠ | پیری شالیار | حەمە كەریم هەورامی | رۆمان | چاپكردن |
| ٢٥١ | شانۆكاری كورد لەیۆتۆپیای ئەزموونگەریدا | بورهان قەرەداغی | لێكۆڵینەوەی شانۆی | چاپكردن |
| ٢٥٢ | سێی دەسەڵات | سالار ئیسماعیل | كورتە چیرۆك | چاپكردن |
| ٢٥٣ | جەربەزە | ساڵح محەمەد ئەمین | كورتە چیرۆك | چاپكردن |
| ٢٥٤ | ئەڵوەنو ئەفسانە | فازڵ كەریم | لێكۆڵینەوەی ئەدەبی | چاپكردن |
| ٢٥٥ | كاتم نییە بۆ شێتی | ئەرخەوان | چیرۆك | چاپكردن |
| ٢٥٦ | بەرهەمەكوردییەكانی جەبار جەباری | سمكۆ جەباری | رۆژنامەگەری | چاپكردن |
| ٢٥٧ | بیبلۆگرافیای نووسینەكانی هەڤاڵ مام جەلال | ئا/ دلێر ئەحمەد | بیبلۆگرافیا | چاپكردن |
| ٢٥٨ | تێكست | چاپو بلاوكردنەوە | گۆڤار | چاپكردن |
| ٢٥٩ | الخاتم | محیی‌الدین زەنگەنە | شانۆگەری | چاپكردن |
| ٢٦٠ | ئاوێنەم شكاند | كەژاڵ ئەحمەد | هۆنراوە | چاپكردن |
| ٢٦١ | الشبك الكورد المنسيون | ئەحمەد شەوكەت | رامیاری | چاپكردن |
| ٢٦٢ | رابەری رۆژنامەگەری نهێنی.. | نەوزاد عەلی ئەحمەد | رۆژنامەگەری | چاپكردن |
| ٢٦٣ | پزیشكی ڤێتێرنەری | د. فەریدون عەبدولستار | پزیشكی | چاپكردن |
| ٢٦٤ | جینۆسایدو كاڵبوونەوە | لەتیف فاتیح فەروج | رامیاری | چاپكردن |
| ٢٦٥ | فاتە | رەزا سەید گوڵ | رۆمان | چاپكردن |
| ٢٦٦ | الحركه القوميه الكورديه.. | د. كاوس قەفتان | رامیاری | چاپكردن |